

## خەڵاتی شێرکۆ بێکەس



## شیعر



## گفتووگۆ



## چیرۆک

## نۆبڵی 2014 پاتریک مۆندیانۆ



## خوێندنەوەی کتێب



## دوو چیرۆک دوو چیرۆکنووس



## شاعیرانی ئیسپانیای ئەمڕۆ



## شانۆ



## ئەدەبی نامە







# بەختیار عەلی

## وەرگری خەڵاتی شێرکۆ بێکەس

سەرەتا سوپاسی زۆرم بۆ هەمووتان.
خۆشحاڵم بەوەی لێرە دەتانبینم.
شتێك زۆر لێی دڵنیام ئەوەیە، بەشی زۆری نوسەران کاتێك دەنوسن بیریان لە هیچ پاداشت و خەڵاتێك نییە، من لە خەڵاتدا هەمیشە جۆرە پارادۆکسێك دەبینم. خەڵات جۆرێکە لە دانپایانانی دەستەجەمعی بە کەسێکدا یان بە کۆمەڵێك کاردا، لە کاتێکدا ئەو کەسە یان ئەو کارانە لە بنەڕەتدا دژ بە هەر ڕۆحێکی دەستەجەمعی





کارابوون. پارادۆکسی نێوان نامۆیی نوسەر و باوەشی گرمی خەڵك پارادۆکسێکە بووە و هەمیشەش دەمێنێت. بۆ من لێرەدا و لەمڕۆدا لە بەر دوو هۆ ئەو پارادۆکس و ناکۆکییە نرخێکی گرنگیان نامێنێت: یەکەم لەبەر ئەوەی خەڵاتەکە لەلایەن کۆمەڵێك نوسەر و هونەرمەند و وەرگێڕەوە دەدرێت، کە رەنگە هەندێیان لە هەمان پلەی ناڕەزاییدا بن، خۆیان ڕۆحی غەریب و ناتەبای دونیای ئێمەن. دووەم: خەڵاتەکە هەڵگری ناوی یەکێك لە پیاوە نامۆ و توڕە و تەنیاکانی مێژووی ئێمەیە «شێرکۆ». وەرگرتنی یەکەم خەڵاتێك بە ناوی ئەم شاعیرەوە، بۆ من رەهەندێکی شەخسی بایەخداری هەیە. یەکێك لە بەرکەوتنە سەرەتاییەکانم لەگەڵ ئەدەبدا لە ڕێگای دیوانەکەی شێرکۆ بێکەس «من تینوێتیم بە گڕ دەشکێت»ـەوە بوو، یەکەمین ساتێك کە هەستمکرد بەزمان شتی سەیر و موعجیزەی گەورە ئەنجام دەدرێت، لەگەڵ خوێندنەوەی شێرکۆدا بوو.

هەڵبەت بڕیار بوو لەم بۆنەیەدا شتێك باس لە ئەزموونی ئەدەبی خۆم بکەم. بەڵام کورتی ئەم دەرفەتە و سروشتی بۆنەکە ڕێگرە لەوەی ئەو کارە بکەم، باسکردنی ئەزموونی ئەدەبی بە خێرایی و لە جێگایەکی وەك ئێرەدا ئەرکێکی سەختە. بەڵام دەتوانم بە کورتی باس لە هەندێك خاڵی گرنگی بڕوا ئەدەبییەکانی خۆم بکەم، هەندێك خاڵ کە مرۆڤ وەك نیشانەی ڕێگا دایاندەنێت، وەك ڕێنوێنێك تا ببینین ئێمە بە چ ڕێگایەکدا هاتووین. لە ژیانی هەموو نوسەرێکدا ئەم ئاماژەی ڕێگا یان ئەم مێخانەی کە بۆ خۆچەسپان دایدەکوتین بوونیان هەیە، چەسپانبوون بە مانا پۆزەتیڤە نیتشەوییە دۆلۆزییەکە، زۆرجار مرۆڤ باس لە جۆرێك لە پۆزەتیڤیزمی نیتشەوی دەکات بەرامبەر نیگەتیڤیتەیتی هیگڵی، کە باس لە داکوتانی شتێك و جێگیرکردنی دەکەم، بە هەمان مانا وشەکان بەکاردەهێنم، بەو مانا دۆلۆزییە. واتە بەو مانایەی کە چی ڕەگەزێك دەبێت لە پرۆسەی دووبارەبوونەدا دووبارەببێتەوە، یان لە پرۆسەی بزاڤبووندا دووبارەببێتەوە. هەموو نوسەرێك کۆمەڵێك پنتی دووبارەبوونەوەی خۆی هەیە، خاڵ هەیە کە هەمیشە لە ناو لێشاوی بزاڤ و گۆڕاندا دەچێتەوە سەری و دەردەکەوێتەوە، منیش وەك نوسەر خاڵی نەبووم لەو بڕوایانە، لەو سەرەتایانەی لە داڕشتنی کاری ئەدەبیدا ڕەچاوم کردون .

**1.** ئەدەبی من ئەدەبێکی دژە واقعی بووە، کەمجار بەرامبەر بە مەزهەبێك وەك بەرامبەر واقعییەت بە گومان بووم. ترسناکترین شتێك لە واقعییەتدا هەوڵی گواستنەوەیەتی بۆ واقع وەکو خۆی، لە دونیایەکدا کە سنوورەکانی نێوان خەون و حەقیقەت لە شکانێکی هەمیشەییدایە، بەردەوام حەقیقەت دوای خەون دەکەوێت، قسەکردن لەسەر بوونی وێنەیەکی لۆژیکی بۆ واقع کاری نەکردەیە. شتێك نییە ناوی واقع بێت وەك خۆی تا ئەدەب بیگوازێتەوە، شتێك هەیە ناوی جیهانی پارچەپارچە و تێکەڵە. «ئاسمانی بەرینی ڕێکەوت» وەك نیتشە ناوی دەنێت. ئەدەب هەمیشە باوەڕنەکردن بووە بەو وێنەیەی کە دونیا دەیبەخشێت بە خۆی، باوەڕنەکردن بووە بەو لۆژیك و پتەوی و یەکگرتووەی کە جیهان دەربارەی خۆی پێشکەشماندەکات. ناواقعی لای من یەکسان نییە بە خەیاڵی، بەڵکو یەکسانە بە تێکەڵەیەکی گەورە لە هەندێك کەرەستەی جۆراوجۆری ڕوانین، پشکنینی ئەودیوی شتەکان، وازهێنان لەوەی کە زاڵ و لۆژیکی و باڵادەستە، جۆرێکە لە دواندنی نەست. نەوەك نەستی تاکەکەسی خۆمان بەتەنیا، بەڵکو نەستی گشتی و نەستی مەعریفیمان. واقع ناتوانێت هیچ شتێك لەسەر خۆی بڵێت گەر بەردەوام وردی نەکەین بۆ یەکە هەرە بچوکەکانی، نەیگێڕینەوە بۆ گەردە وردەکانی، بۆ ساتە هەڵهاتووەکانی، بۆ شکاندنی هەموو پنتە جێگیرەکانی کە دەشێت ڕێکەوتنی درۆزنانەمان بەسەردا بسەپێنێت، ئیشی ئەدەب ئەوەیە پرۆسەی بوون لە ساتی جوڵە و مردن و فەنابوونی بەردەوامدا نیگاربکاتەوە، واتە لە ڕەهەندە تراژیدییەکەیدا ... واقعییەت بەبڕوای من نیشانەی نەمانی توانای سەرسامییە لە مرۆڤ، بەرامبەر بەوە پێموایە ئیشی ئەدەب پاراستنی هێزی سەرسامبوونە لە ناوماندا. ئەگەر بواری فەلسەفە و سیاسەت و مێژوو شتە گەورەکان بووە، ئەدەب پارێزەر و بەرگریکەری گەورەی شتە وردەکانە. ڕوانین لە جیهان وك شوێنی دۆزینەوەی بەردەوام، وەك کانگایەك لە وێنەی ناکۆتا، ئەوە پەیامی سەرەکی پشت ئەدەبیاتە.

**2.** ئەو پرسیارە کە ئایا کێییە لە ناو نوسەردا قسەدەکات؟ ئایا دەنگی نوسەر دەنگی سوبێکتی نوسەرە؟ پرسیارێکی گرنگی ئەدبیاتە. من باوەرم زۆر بە مردنی نوسەر نییە، زمان و کولتوور چەند پڕ لە جەبربن، کرداری نوسین دەرککردن و خۆڕاپسکان و خۆڕزگارکردنە لەو جەبرانە. نوسین دووبارەکردنەوە و بەرهەمهێنانەوەی ئەو دەسەڵاتە نییە کە لە ناو زماندا هەیە، بەڵکو شکاندن و جێهێشتن و بەلاوەنانێتی.






من باوەرم بەوە هەیە کە دەنگی نوسەر پتر لەوەی دەنگێکی تاکەکەسی و تایبەت بێت، دەنگێکە واز لە هەقی تایبەتی خۆی دەهێنێت بۆئەوەی لێگەڕێت ئەوانی تر لە ڕێگایەوە قسەبکەن. باوەرم بە مردنی نوسەر نیە، بەڵام باوەرم بە کەنارەگیری نوسەر هەیە، تا لێبگەڕێت ئەوانی تر بدوێن. وازهێنانی نوسەر لەدەنگی خۆی هەڵبژاردنێکی جەبری نییە، بەڵکو هەڵبژرادنێکی ئازادە. کاتێك نوسین وەك دەنگی شەخسی نوسەر حساب ناکەین، لەبەرئەوەیە کە نوسەر ئازادانە دەستبەرداری دەنگی خۆی دەبێت. منی نوسەر ماسکی کاراکتەرەکانە نەوەك بە پێچەوانەوە. ئەدەب بە مانا باختینییەکەی، بە مانا کەرنەفالییەکەی، بە مانای وازهێنانی نوسەر لە سوبێکتی خۆی تا ئەوانی تر لە ڕێگای ئەوەوە گوزراشت لە خۆیان بکەن. من لەزۆر رۆماندا بە جۆرێکی سەرسەختانە پۆلیفۆنی بووم وەك مەرگی تاقانە و غەزەلنوس، بەڵام لە ستایلی پۆلیفۆنیش بترازێت، ئەدەب خۆی بە گشتی فرەدەنگە. لە فرەدەنگیدا نوسەر نامرێت، بەڵکو وندەبێت، خۆی دەشارێتەوە، نادوێت، بەڵکو دەنگی خۆی بە قەرز دەدات بە تەواوی مەخلوقات. ئەوە ئەو ئەدەبەیە کە من زۆر باوەرم پێیەتی. لێرەدا نوسەر ئازادە دەبێت بەچی... دەنگی جانەوەرێك، دەنگی کورسیەك لای شێرکۆ، دەنگی گوێدرێژێك لای قانیع، دەنگی ئەسپێك لای پامۆك... ئەو لەزەتە کە مرۆڤ چۆن لە کرنەفالدا دەتونێت کۆستیومی فیرعەونێك لەبەربکات، لە ئەدەبیشدا ئازادین، سوبێکتی خۆمان لە هەموو دەستنیشان و ناونانەکان جیابکەینەوە. دۆزینەوەی دەنگی ئەویدی ئەوە ئەو ڕێگا سەختەیە کە لەڕێگای ئەدەبەوە بۆی دەگەڕێین... ئەدەب گەڕانە بەدوای ئەوانی دی لە ناوخۆماندا.

3. ساتی نوسین جۆرە ساتێکە وەك ئەوەی بنیامین پێیدەڵێت وەستانی دیالەکتیکی. بە مانای چڕکردنەوەی ساتە مردوەکان، زیندوکرنەوەی ئەوەی لە یادکراوە، وەخەبەرهێنانەوەی ئەوەی وادیارە جارێکی تر ناگەڕێتەوە. وەستان بۆئەوەی ببینین و گوێبگرین چی روویداوە. ئەدەب وەستاندنێکی مێژووە بۆ ئەوەی کاتی پێویستمان بۆ تێڕامانی هەبێت، بۆ ئەوەی کاتی پێویستمان بۆ گوێگرتن لە دەنگە خەفەکراوەکان هەبێت. ئەدەب لە دەمێکیشدا کە خەریکی پێشبینی داهاتووە هێشتا هەر سەرقاڵی گێڕانەوەی چیرۆکی ڕابوردووە. باوەڕم بەو ئەدەبانە

نییە کە بەر لەوەی گوێ لە دەنگی ڕابوردوو بگرن، قسە لە پێشبینی داهاتوو دەکەن، دەبێت بزانین مرۆڤ دوێنێ چۆن بووە تا تێبگەین سبەینێ دەبێت مرۆڤ چۆن بێت. ئایا، ساڵی **1984** ڕۆمانێکە باسی داهاتوودەکات؟ ڕۆمانی پیشبینییە؟ بێگومان نا. ڕۆمانی **1984** ڕۆمانێکە باس لە فۆرمێکی تری تۆتالیتارییەتی ساتی خۆی دەکات، قسەیە لە ڕەوشێکی کۆنترۆڵ و چەوساندنەوەی مرۆڤ کە زۆر پێشتر زەمینەسازی بۆ کراوە. گوێگرتن لە دەنگی خەفەکراوی قوربانییەکانی دێرینە، هێزمان دەداتێ بزانین قربانییەکانی پاشەڕۆژ چۆن دەژین. ئەدەب تەنیا گەیاندنی دەنگی شتەکانی دی یان ئەوانی دی نییە، بەڵکو زیندووکردنەوەی دەنگی خنکاوەکانی ناو مێژووشە. من لەو ڕوانگەیەوە سەیری ڕۆمانم کردوە و لەو ڕوانگەیەشەوە، پەیوەندی ئەدەبم بە ڕابوردووەوە خوێندۆتەوە. پەیوەندی ئەدەب بەر لە هەر شتێك بە ئێستا و ڕابوردووەوەیە، هەر دەرەنجامگیرییەك بۆ داهاتوو ئەوە خوێنەران دەیکەن، کاری ئەدەب بە پلەی یەکەم ئەوەیە ئەوەی لە بەردەم هەڕەشەی مردندایە، لە چنگی بیرچوونەوە و لە ناوچووندایە ڕزگاربکات. بە بروای من مێژووی گشتی، بەردەوام لە ڕێگای چەندین دەزگا و ئۆرگان و ئاژانسی گەورەوە خۆی دەپارێزێت، ئەوەی کە دەفەوتێت و بیردەچێتەوە مێژووی مرۆڤە تاکەکانە، مێژووی تایبەتی مرۆڤەکانە. ئەدەب ستایشی پەراوێزە، پاراستنی ئەوانەیە کە لە هیچ جێگایەکی دیکەدا یادگاریان هەڵناگیرێت، ناو ئەدەب نەبێت. بە کورتی هەوڵی من گواستنەوە بووە لە مێژوی گشتییەوە، بەرەو مێژوی شەخسی. وەك چۆن واقعێکی گشتی بوونی نییە، مێژوویەکی گشتیش بوونی نیە، مێژووی ڕاستەقینە تەنیا ئەو مێژووەیە کە لە ژیانی تاکەکاندا دەردەکەوێتەوە.

**4.** «هوشیاریی درِ» چەمکێکە دژ بە واقعییەت بەکاریدەهێنم، مرۆڤ هیچ کات بە شوێنی کۆمەڵایەتی دەست نیشان ناکرێت، بەڵکو بە هوشیاری و بە توانای بینین و نەبینین. ساویلکانەترین تێزێك و کلێشەییترین تێزێك ئەوەیە هوشیاری مرۆڤ بە شوێنگە کۆمەڵایەتییەکەیان بپێوین. شتێك هەرگیز باوەرم پێ نەبووە ئەوەیە، کاراکتەرەکانم بە پێی شوێن و ڕێگە و جێگای کۆمەڵایەتییان دیاریبکەم. پاڵەوان لەو تێکستانەدا کە من نوسیومن، بەردەوام لە شەڕکردندان لەگەڵ شوێنگای کۆمەڵایەتی خۆیاندا، کۆیلەی ئەو جێگایە نین، بەڵکو ڕەخنەگر و جێهێڵ و تێکشکێنی ئەو شوێنەن. هیچ پاڵەوانێکی من فەیلەسوف نییە، وەك هەندێك حەزدەکەن بەتانەوە وابیڵێن. بەڵام پاڵەوانەکانم، لە خەندانەوە بۆ ڕێزانی مەلەك بین، لە ئەشرەفەوە بۆ وەفای رەفعەت بەگ،







هەمیشە هوشیارییەکی دڕ و ناتەبایان هەیە. ئەم هوشیارییە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی بەرهەمی نەهێناوە، بەڵکو لەسەر ئەو ڕاستییە بەندە کە مرۆڤ لە هەر هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتیدا بێت دەتوانێت هوشیاری سەربەخۆ و دڕی خۆی هەبێت. هوشیاریی دڕ ئەو هوشیارییە یە کە دژ بە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی شەڕدەکات و وادەکات مرۆڤەکان بتوانن شوناسێکیان هەبێت جیا لەو شوناسەی کۆمەڵگا و مێژوو دەیسەپێنێت بەسەریاندا. قسەی من هیچ کات لەوە تێنەپەڕیوە کە قسە بێت دەربارەی هوشیارییەکی غەمگین، بەڵام زیرەك و کونجکۆڵ. پارادۆکسی سەرەکی لە نوسینەکاندا ئەوە بووە؛ مرۆڤاکان چیان دەوێت و بەچی دەگەن. وەك وەفا دەڵێت گرنگ ئەوە نییە مرۆڤ ناگات، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بزانێت ناگات و هەر دەست بە گەشتەکەی بکات. ئەدەبی من نە ئەدەبی ئومێد بووە و نا نائومێدی، بەڵکو ئەدەبی کردار بووە، پاڵەوانەکانی من هیچیان بوونەوەری پاسیف نین، بەڵکو دڵنیان کە ئەنجامێك هەیە نایگەنێ و لەگەڵ ئەوەشدا بەرەو پیری دەڕۆن.

**5.** ئەدەب هێزێکی گۆڕانکای گەورەیە، لە دونیای ئێمەدا بەردەوام بە هۆی ئەو قیرە قرِ و دەنگە دەنگە زۆرەی سیاسەت پەرستەکانەوە، ڕۆڵی ئەدەب بچوك و بچوکتر دەکرێتەوە و زیاتر دەخرێتە پەراوێزەوە. ئەدەب تاکە هێزی کاریگەر نییە، بەڵام یەکێکە لە هێزە هەرە گەورەکان، وە تاکە هێزێکە کە تۆوی ئەلتەرناتیڤی ڕاستەقینە دروستدەکات. فیکری سیاسی زۆرجار بە ڕۆشنبیرە سیاسییەکانیشەوە، هێزی پارێزەرن بۆ دۆخە زاڵەکان، دروستکەرەوەی ئەو شتانەن کە دەبێت بڕوخێن. من زۆر باوەڕم بەو تێزەی ئەدۆرنەیە کە هەندێ جار ئەگەر تروسکەیەك هەبێت ئەوا لە هونەر و ئەدەبەوە دێت. ئێستا پەلاماری هەمەلایەنە بۆ سەر ئەدەب و شیعر لە دونیای ئێمەدا شێوازێکی پرۆگرامیزەکراوی وەرگرتووە. ساڵانێکی زۆرە لای ئێمە ئەدەب دەکەوێتە بەر پەلاماری قەڵەمە بچوکەکان و لە هێزی شۆڕشگێڕانە و نرخی ڕادیکالی کەم دەکرێتەوە، تا لەو ڕێگایەوە ڕۆح و گوێی کۆمەڵگا تەنیا بە وەعزی سیاسی و بە حیکمەتی ڕاوێژکارەکان پڕبێتەوە. بەبڕوای من وەزیفەمانە گەورەیی ئەدەب بەرامبەر بەم هێرشە بپارێزن. سیاسەت لە دونیای ئێمەدا لە هیچ فۆرمێکیدا هێزی ڕزگارکردنی مرۆڤ نەبووە، بەڵکو پرۆگرامی کۆنترۆڵکردن

و سنوردارکردن و هەژارکردنی ئینسان بووە. شوێنی لە بۆتەدانی ئینسان بووە لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژی و فیکری تەسکدا، لە خۆرهەڵاتدا ئەدەب هەمیشە پەنجەرەیەکی گەورەتر بووە بەسەر ژیان و ڕووبەرە فەرامۆشکراو و خنکاوەکاندا و دەبێت بەوجۆرەش بمێنێتەوە.

جارێکی تر داوای لێبوردن دەکەم و سوپاس بۆ ئێوە بۆ دەزگای سەردەم و بۆ هەموو ئەوانەی ئەم بۆنەیان سازکردوە.

**تێبینی:**

**1**/ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڕیاریداوە لە یادی دامەزراندنیدا لە ڕۆژی **25-8**ی هەموو ساڵێکدا خەڵاتی شێرکۆ بێکەس ببەخشێت بە نووسەرێك و وەرگێڕێك، لە ساڵی یەکەمی بەخشینی ئەم خەڵاتەدا تەنها نووسەرێك ئەم خەڵاتەی پێ بەخشرا کە ئەویش بەڕێز بەختیار عەلی بوو.

**2**/ ئەم وتارەی بەختیار عەلی لە کاتی بەڕێوبردنی مەراسیمی بەخشینی خەڵاتی شێرکۆ بێکەسدا بە هۆی هۆکاری تەکنیکییەوە نەکرا پێشکەشبکرێت، لێرەدا دەقی وتارەکە بڵاوکراوەتەوە.



# دوکانی تووتن

## فێرناندۆ پێسەوا

**و. لە ئینگلیزییەوە: ماردین ئیبراهیم**

من هیچ نیم
قەت هیچ نابم
ناتوانم بمەوێت شتێك بم
بەڵام هەموو خەونەکانی گێتی لە مندایە.

پەنجەرەکانی ژوورەکەم،
ژووری یەکێك لەو ملیۆنانەی کەس دەربارەیان هیچ نازانێت
"ئینجا ئەگەر شتیش بزانن، چی دەزانن؟"

بەسەر نهێنیی شەقامێکدا دەکرێتەوە کە بەردەوام خەڵکی پێدا دێ و دەڕوا
شەقامێك هیچ فیکرێکی تێناچێت، هەموو فیکرێکی تێدەچێت
ڕاستەقینە، نامومکینانە ڕاستەقینە، دڵنیا، نەزانراوانە دڵنیا،
لەگەڵ نهێنی شتگەلی ژێر بەردەکان و بوونەکان،
لەگەڵ مردن کە دیوارەکان شێدار دەکات و پرچی پیاوانیش سپی دەکات،
لەگەڵ قەدەردا کە گالیسکەی هەموو شتەکان بۆ سەر ڕێی نەبوون دەئاژوێ.

من ئەمڕۆ دۆڕام، وەك ئەوەی حەقیقەت فێر بووبم
من ئەمڕۆ ڕوون و ئاشکرام، وەك ئەوەی لە گیانەلادا بم
وە سەروکارێکی وام لەگەڵ شتەکاندا نەبووە
هێندە نەبێت ماڵئاواییان لێبکەم، ئەم باڵەخانەیە و ئەم قەراغ جادەیە دەبنە
ڕیزێك فارگۆنی شەمەنەفەر، لەگەڵ شووتی بەڕێکەوتن
لە سەرمدا دەتەقنەوە
دەمارەکانم دەلەرزن و ئێسقانەکانم جیرەجیڕ دەکەن کاتێك لادەدەین.

ئەمڕۆ پەشۆکاوم، وەك پیاوێکی تەحەیورماو، کە کەشفێکی کردووە
و دواتر هەموو شتێکی لە یاد کردووە
ئەمڕۆ من پارچەپارچە بووم لە نێوان دڵسۆزییەك کە هەمە
بە حەقیقەتی دەرەکیی دوکانی تووتن لەوبەری شەقامەکە و
حەقیقەتی ناوەکیی هەستی من کە پێی وایە هەموو شتێك خەونە.



من لە هەموو شتێکدا دۆڕام
جا خۆ من هیچ ئومێدێکم نەبوو تا بدۆڕێم
ئەو پەروەردەیەم جێ هێشت کە پێم درابوو،
بە پەنجەرەی دیوی پشتەوەی خانووەکەدا دابەزیم،
چوومە لادێ بە پلانگەلی قەبەوە.
بەڵام تەنیا گیا و درەختەکانم بینی
لەگەڵ ئەو خەڵکانەش کە هەر ڕێك وەك خەڵکانی دیکە وابوون.
لە پەنجەرەکەوە خۆم هەڵدایەوە ژووری و لەسەر کورسییەك دانیشتم. ئینجا بیر لە چی بکەمەوە؟

من کە ئێستا نازانم کێم، چۆن بزانم لە داهاتوودا دەبمە چی؟
ببمە ئەو شتەی بیری لێدەکەمەوە؟ بیر دەکەمەوە ببمە زۆر شت!
خەڵکێکی زۆر هەن بیر لە هەمان شت دەکەنەوە کە ببن بەڵام خۆ هەموومان ناتوانین ببینە هەمان شت!
بلیمەتم؟ لەم کاتەدا
سەدان هەزار مێشك لایان وایە کە وەك من بلیمەتن،
ڕەنگە مێژوو یەك دانەشیانی لە بیر نەمێنێت،
هەموو سەرکەوتنە ئەندێشەکراوەکانیان دەبنە شیاکە.
نا، من ئیمانم بە خۆم نییە.

شێتخانەکان تژین لە شێتانی دڵنیا!
ئەرێ من، کە هیچ دڵنیاییەکم نییە، مافم زیاترە یان کەمتر؟
نا، تەنانەت منیش نا...
لە ناو چەند ژوورۆچکە و مووورۆچکەی جیهاندا
ئەوانەی خۆیان بە بلیمەت دەزانن لەم کاتەدا خەون دەبینن؟
چەند ئومێدی ڕوون و خانەدان و سەرکەش
- بەڵێ هەر بە ڕاستی ڕوون و خانەدان و سەرکەش
وە تەنانەت قابیلی وەدیهاتن
قەت ڕووناکیی ڕۆژ نابینن، یان گوێیەکی هاوسۆز نابیننەوە؟
دنیا بۆ ئەوانەیە کە بۆ داگیرکردنی لە دایک بوون،
نەك بۆ ئەوانەی خەون بە داگیرکردنییەوە دەبینن، با لەسەر حەقیش بن.
من لە خەونەکانمدا زۆر لە ناپلیۆنم زیاتر کردووە.



من لە مەسیح زیاتر مرۆڤایەتیبوونم لە سینگە گریمانکراوەکەمدا هەڵگرتووە.
من بە دزییەوە فەلسەفاندوومە وەکو کانت و قەت نەمنووسیووە
بەڵام من ئێستا، ڕەنگە هەتاهەتایە پیاوی ناو ژوورۆچکەیەك بم،
با لە ناو یەکێك لەو ژوورۆچکانەشدا نەژیم.
من بۆ ئەبەد ئەو کەسە دەبم کە بۆ ئەوە لە دایك نەبوو؛
من بۆ ئەبەد ئەو کەسە دەبم، کە کواڵیتیی خۆم هەبوو؛





من بۆ ئەبەد ئەو کەسە دەبم، کە چاوەڕێم کرد
دەرگایەك بکرێتەوە، لە دیوارێکدا کە دەرگای نەبوو
گۆرانیی ئەبەدییەتم لە کولانەی مریشکێکدا چڕی
وە دەنگی خودام لە بیرێکی سەرداپۆشراودا ژنەفت
باوەڕت پێمە؟ نا، باوەڕ بە هیچ شتێك مەکە.
لێگەڕێ با سروشت بڕژێتە بان سەری پڕ ئاژاوەم
ئەوە خۆرە، ئەوە بارانە، وە ئەوە بایە پرچم دەماڵێت،
وە لێگەڕێ هەموویان بێن ئەگەر قەرارە بێن، یان لێیان گەڕێ با نەیەن.
دڵە کۆیلەکانی ئەستێرەکان ئێمەین،
هەموو جیهانمان داگیر کرد بەر لەوەی لە نوێنەکانمان بێینە دەرێ،
کەچی خەبەرمان بووەوە ئینجا تەمومژە،
لە خەو هەستاین ئینجا نامۆییە،
چووینە دەرێ ئینجا سەرتاپای زەوییە
ئینجا کۆمەڵەی خۆر و ڕێگای کاکێشان و ئەبەدییەتە.

(شوکولاتەکانت بخۆ، کچۆڵە،
شوکولاتەکانت بخۆ!
بڕوام پێبکە، لەسەر زەویدا هیچ شتێك وەك شوکولاتەکان میتافیزیك نییە،
وە هەموو دینەکانی دنیا بخەیتە سەر یەك بە قەدەر دوکانێکی نوقڵونەبات دەرست فێر ناکات.

بخۆ، کچۆڵەی پیسوپۆخڵ، بخۆ!
خۆزگە بە هەمان ڕۆحی بێگوناهی تۆ شوکولاتەکانم خواردبا!
بەڵام چونکە بیر دەکەمەوە بۆیە ناکارێم، کاغەزەکەی لێدەکەمەوە کە سیمێکە،
فڕێی دەدەمە سەر عەرد، وەك چۆن ژیانم فڕێ داوە).

بەڵام خۆ هیچ نەبێت، لە تاڵاوی ئەو ڕاستییەوە کە دەمەوێت شتێك بم و قەت نابم،
پەلەپڕوزێی نووسینی ئەم دێڕانە کە دەروازەیەکی شکاون بەرەو مەحاڵ، دەمێننەوە،
بەڵام خۆ هیچ نەبێت بە ناقایلی سەیری خۆم دەکەم و ئەسرین نارێژم،
هیچ نەبێت خانەدانانە
جلوبەرگی پیس کە منم ـ بەبێ لیست ـ بۆ ناو ڕەوتی شتەکان فڕێ دەدەم،
من لە ماڵەوە دەمێنمەوە، بەبێ کراس.

(ئاه ئەی سەبووریی من، ئەی ئەوەی نیت لەبەر ئەوە سەبووری دەدەی،
تۆ ماخوایەکی گریکی بیت، وەك پەیکەرێکی زیندوو بێیە خەیاڵ،
یاخود ژنێکی ئەریستۆکراتی ڕۆم، بێئەندازە خانەدان و ترسناك،
یاخود شازادەیەکی غەزەلخوێنەکان، دڵڕفێن و نازك
یاخود ژنە مارکیزەیەکی سەدەی هەژدە، خۆپارێز و شانومل ڕووت،
یاخود لەشفرۆشێکی بەناوبانگ لە نەوەی باوانمان،
یاخود شتێکی مۆدێرن، ناتوانم بە تەواوی بیهێنمە پێش چاوم ـ
هەرچییەك بێت لەوانە، هەرچییەك هەیت، ئەگەر دەتوانی ئیلهامم





بدەیتێ، بمدەرێ!
دڵم سەتڵێکی دەمەونخوونە.
وەك چۆن بانگکەرانی ڕۆحەکان، ڕۆحەکان بانگ دەکەن،
منیش خۆم بانگ دەکەم، بەڵام دەستم لە هیچ گیر نابێت.
دەچمە لای پەنجەرەکە و شەقامەکە بە ڕوونییەکی تەواوەوە دەبینم.
دوکانەکان دەبینم، شۆستەکان دەبینم، ئوتومبیلەکان دەبینم تێدەپەڕن،
بوونەوەرە زیندووە جللەبەرەکان دەبینم بە لای یەکدیدا ڕەت دەبن،
سەگەکانیش دەبینم کە ئەوانیش هەن،
هەموو ئەوانەش بارم گران دەکەن وەك حوکمدران بە مەنفیکردن
هەموو ئەوانەش بێگانەن، وەك هەموو شتەکانی تر).

من ژیاوم، خوێندوومە، عەشقم کردووە و تەنانەت باوەڕیشم هەبووە،
ئەمڕۆش سواڵکەرێك نییە ئێرەیی پێنەبەم هەر چونکە من نییە.
سەیری شیتاڵ و ئازار و هەڵەکانی یەك بە یەکیانم کرد،
پێشم وایە: ڕەنگە تۆ قەت نەژیابیت یان نەتخوێندبێت یان عەشقت نەکردبێت یان باوەڕت نەبووبێت
(لەبەر ئەوەی مومکینە هەموو ئەو شتانە بکەیت بەبێ ئەوەی هیچیانت کردبێت)؛

لەوانەیە تۆ بە سانایی ژیابیت، وەك ئەوەی کاتێك مارمێلکەیەك کلکی قرتابێت
کلکەکەش هەڵبەزێتەوە، بەبێ مارمێلکەکە.
من ئەوەم لە خۆم دروست کرد کە باش نەبووم لە دروستکردنیدا،
لەوەشدا کە باش بووم لە خۆم دروستی بکەم، نەمکرد.
من پۆشاکێکی هەڵەم لەبەر کرد
کە بۆ کەسێك دانرابوو کە من نەبووم، کردمە بەرم و هیچم نەوت و خۆم لێ تێك چوو.
کاتێك چووم ماسکەکە لەسەرم داماڵم،
لە دەموچاوم گیر بوو.
کاتێك داماڵی و لە ئاوێنەدا خۆم بینی،
پیر ببووم.
سەرخۆش بووم و چیدی نەمدەزانی ئەو جلە بپۆشم کە دامنەنابوو.
ماسکەکەم تووڕدا و وەك سەگێکی بێوەی لە مەخزەنێکدا خەوتم،
ئینجا ئەم چیرۆکە دەنووسم تاکو بیسەلمێنم من کەسێکی باڵام.

ئەی جەوهەری میوزیکی شیعرە بێکەڵکەکانم،
خۆزگە توانیبام وەك شتێك سەیرتان بکەم کە خۆم خولقاندوومە
لە باتی ئەوەی هەمیشە سەیری دوکانی تووتنەکەی ئەوبەر شەقامەکە بکەم،
ساتمە لە هۆشیاریی بوونی خۆم دەکەم،
وەك بەرەیەك کە سەرخۆشێك ساتمەی لێدەکات



یان وەك بەرەکۆنی بەر دەرگایەك کە قەرەجەکان
دەیدزن و بە کەڵکی هیچ نایەت.

خاوەنی دوکانی تووتنەکە هاتە بەر دەرگاکە و وەستا.
من بە نارەحەتیی ملێکی نیمچەلارەوە لێی دەڕوانم
لەگەڵ نارەحەتی ڕۆحێکی نیمچە دەستپێڕاگەیشتوو.
ئەو دەمرێ و منیش دەمرم.
ئەو ساینبۆردەکەی جێ دەهێڵێت، من شیعرەکانم جێ دەهێڵم.
دواجار ساینەکەشی دەمرێت، هەروەها شیعرەکانی منیش،
دواجار ئەو شەقامەی ساینەکەشی لێیە، دەمرێت،
ئەو زمانەش کە شیعرەکانی منی پێنووسراوە.
ئینجا ئەو هەسارە بزۆکەش کە ئەو ماجەرایەی لەسەر ڕوو دەدات، دەمرێت.

لە هەسارەکانی دیکەی کۆمەڵەی خۆرەکانی تر شتگەلی لە بابەت خەڵك
بەردەوام دەبن لە خولقاندنی شتی لە بابەت شیعر و لەژێر سایەی شتگەلی لە بابەت
ساینەکاندا دەژین،
هەمیشە شتێك ڕوو دەکاتە شتکی دی،
هەمیشە شتێك بێکەڵکە وەك شتێکی دی،
هەمیشە مەحاڵ گەمژەترە لە حەقیقەت،
هەمیشە ڕازێکی ناوەکی ڕاستەقینەیە وەك نهێنییەکی خەوتووی دەرەکی.

هەمیشە ئەم شتە یان ئەوەیان، یاخود نە ئەمیان و نە ئەویان.

بەڵام پیاوێك خۆی بە دوكانی تووتنەكەدا كرد "تاكو تووتن بكڕێت؟"
وە كتوپڕ حەقیقەت گڕی دام.
تۆزێك لەسەر كورسییەكەم ڕاست دەبمەوە ـ پڕ وزە، قایل، مرۆ ـ
وە هەوڵ دەدەم لەم دێڕانەدا پێچەوانەكەی بنووسم.

جگەرەیەك دادەگیرسێنم كاتێك بیر لە نووسینیان دەكەمەوە،
ئینجا لەو جگەرەیەدا ئازادی لە هەموو بیرێك ڕزگار دەكەم.
چاوەكانم بە شوێن دووكەڵەكەدا دەڕۆن وەك ئەوەی شوێنپێكانی خۆم بن
ئینجا چێژ وەردەگرم، بۆ ئەو ساتە نازك و گونجاوە،
وە ئازاد لە هەموو گریمانەكردنێك
وە هۆشیاربوون لەوەی كە میتافیزیك بەرئەنجامی ئەوەیە هەست ناكەین باش بین.
ئینجا لەسەر كورسییەكەم ڕۆدەنیشمەوە
بەردەوام دەبم لە جگەرەكێشان.
ئەوەندەی قەدەر ڕێم پێبدات، بەردەوام دەبم لە جگەرەكێشان.

(ئەگەر كیژی ژنەجلشۆرەكەم بخوازم
ڕەنگە بەختەوەر بم).



لەسەر کورسییەکە هەڵدەستم، دەچمە لای پەنجەرەکە.

ئەو پیاوەی لە دوکانی تووتنەکە هاتە دەرێ "وردە دەخاتە گیرفانیەوە؟"
ئۆی دەیناسم: ئەوە ئیستیڤیسی نامیتافیزیکە.
(خاوەنی تووتنەکە هاتە لای دەرگاکە).
وەك ئەوەی بە هۆی غەریزەیەکی یەزدانییەوە بێت، ئیستیڤیس ڕووی وەردەسووڕێنێت و دەمبینێت.
سڵاوم لێدەکات، منیش وەڵامی دەدەمەوە 'سڵاو، ئیستیڤیس' و گەردوون دەکەوێتە شوێنێکی خاڵی لە ئایدیالەکان و ئومێدەکان،
ئینجا خاوەنی دوکانی تووتنەکە زەردەی دێتێ.

# جەهەننەمی بچووك

## غەمگین بۆڵی



(من، بەڵێ من)
بیر لە ڕێگەیەکی دیکە دەکەمەوە و
بە یادی شارێکی بێدەنگ ترۆمبێلەکەم دەسووڕێنمەوە و
زەوییش لەگەڵ خۆمدا دەسووڕێنمەوە!
بە یادی گەراجێکی فێنك
بە یادی شارێکی بێدەنگ
بە یادی ژیانێکی بەمانا ژیان
بە قاچی ڕاستم ئیستۆپ دەکەم!
...
من، بەڵێ من.





(دێمە خوارەوە)
دڵم لە هەموو گیرفانەکانم گەورەترە
دڵم کون کونیش بووە و
ناهێڵم سەرئاو بکەوم
لە ناو حەوشە گەورەکەی سینگمدا،
قاوەیەك لەگەڵ مووەکان دەخۆمەوە
لە ناو گیرفانمدا تەلەفۆنێکم بۆ دێت و
هەر لە ناو گیرفانیشمدا کەسێك قسە دەکات.
ئەم قسە و ژاوەژاوە بێزارم دەکات و
لە ترۆمبێلەکەم دێمە خوارەوە و
لە خوارەوەیش..
کەمێك زیاتر دێمە خوارەوە و
دێمە خوارتریشەوە!

(شارێك بە فانیلەی عەلاگەوە)
بەناو کەللەسەری پیاوێکی دڵگەورەدا،
شار دەسووڕێتەوە
حەوسەڵەی نەماوە شار
بۆ کڕینی نیو کیلۆ ڕاستگۆیی



بازاڕەکان:
خۆیان بۆ قاوەخانەکان ڕووت دەکەنەوە
کافتریایەکیش...
دەیەوێت بایی سێ ڕۆژ هەوای فێنکی باخچەیەك بکڕێت
بازاڕ جمەی دەهات لە هەڕاجی دووکەڵ و
دووکەڵی ترۆمبێلی مۆدێرنە و
دووکەڵی کارگەی پێڵاو و
دووکەڵی ناو دووکەڵ
دووکەڵی مرۆڤەکانیش.

گزۆزی ترۆمبێلەکان کۆخەکۆخیان بوو
کارگەکان لە گەرمان ئارەقەیان دەچووە ناو ئامێزی ئاسمان
جگەرەکان ئاگریان بەردەدا هەناویان و
دووکەڵیان بە درەختەکانی شاردا دەکرد و
شاریش بە فانیلەیەکی عەلاگەوە.

(شار بۆتە جەهەننەمێکی بچووك)
شار لەسەر عارەبایەك باوەشێنی لە خۆی دەکرد و
بە فانیلەی عەلاگە و شۆرتێکی بچووکەوە.







سەیری دەموچاوی بەدووکەڵی گەڕەکەکانی دەکرد
سەیری نێوچاوانی ئارەقاویی شەقامەکانی دەکرد
سەیری شپرزەیی پیاوەکەشی دەکرد.
شار دەیویست بە جۆرێکی دیکە بژیت
وشەکانی ئەو شیعرەی کردبووە نیشتمانی درەخت و گوڵ
خەیاڵەکانی کردبووە ڕووبار و تاڤگە
سێ چوار دەبدەبە هەوای ڕەنگاوڕەنگی کڕی
نیو کیلۆ ڕۆحێکی قورسی بۆ مرۆڤبوونی کڕی.

پیاوێکیش، ڕەنگە هەمان ئەو پیاوەی ناو شیعریش بێت
دەیەوێت هەوای فێنکی سەوزایی بکڕێت
سەوزەیش هەوای فێنکایی فرۆشراوە
دەیەوێت هەوای پاك لە شاردا بدۆزێتەوە!
بازاڕەکان درۆزنن وەك ژووری شاعیران
بازاڕەکان قەڵەباڵغن وەك ژووری ژنان
پیاوێکیش، ڕەنگە هەمان ئەو پیاوەی ناو شیعریش بێت
ژوورەکەی پڕ کردووە لە عەلاگەی هەوای ڕەنگاوڕەنگ
فێنککەرەوەکەش فێنکایی خەوی لێکەوتووە
هاوینی گەرم ئارەقەی بەویش کردووە
موبەریدەی لە پێش تەلەفیزیۆن تەریق کردۆتەوە



هەواڵی گەرمی شار
هەواڵی ناخۆشی شار
هەواڵی جەهەننەمی شار
پێڵاوەکانیشی زیندانی کردووە
...
شار بۆتە جەهەننەمێکی بچووك!

(جیهانی بچووك)
وەك پرچی ئاڵوزکاوی بەیانیان حەوسەڵەم تێك ئاڵاوە
وەك مووبەریدەیەکی بەرهەتاو...
چوومەتە خەیاڵی باخچەیەکی فێنکەوە
وەك مەنجەڵێك ماستی لەبیرکراوی ناو دووکان
خزاومەتە ناو ترشاوی جیهانێکی بچووکترەوە
وەك ترۆمبێلێکی ماندووی پیاوێکی ورگن
چوومەتە خەیاڵی گەراجێکی پەراوێزەوە
وەك ڕژانی یەکەمین کۆتایی دڵۆپەخوێنی کچێنی
چوومەتە ناو مرۆڤەکانی جەهەننەمێکی بچووکەوە.







(قاچێکی نەخۆش)
دەبێت بزانین قاچەکان لە ناو پێڵاودا زیندانن
دەبێت بزانین قاچەکان بەڵایەکی خۆشن بەسەر زەوییەوە
دەبێت بزانین قەبرستان جلوبەرگ و پێڵاوی ژیانە
دەبێت بزانین قەبر خەوێکی دوورودرێژی مەرگە
دەبێت بزانین عەشقی مۆدێرنە خوێنساردە
دەبێت بزانین ماچی مۆدێرنە لە ناو سەلاجە هەڵدەگیرێت
دەبێت بزانین مۆدێرنە دەرهاویشتەی سروشتە
دەبێت بزانین ترۆمبێل سەرەتا گوێدرێژ بووە
دەبێت بزانین پاپۆڕ و بەلەم قاز و مراوی بوونە
دەبێت بزانین شەمەندەفەر مار بووە
دەبێت بزانین تەنکەر کوللە بووە
دەبێت بزانین تایە پێڵاو بووە
دەبێت بزانین یەکەم چیرۆکی سەر زەوی چی بووە
دەبێت بزانین هەواڵی گەرماوگەرم شاری گێژ کردووە.

قاچێکی نەخۆش،
خۆی لە گۆڕەپانی بازاڕدا دەتەقێنێتەوە
سەدان قاچ کوێر دەکات و



پیاسەکان دەکەونەوەماڵەوە
دەستێك بینایی وێران دەبێت و
پرتەقاڵەکان لە لای سێوەکان بۆیان دەگریەن.
منداڵێك هاواری لەگەڵ دووکەڵ بەرز دەبێتەوە،
ئامێزی شین و ڕەشی ئاسمان و
پێڵاوەکانیشی پڕ دەبن لە میزی ترس و تۆقین.

(گۆرانیی پیاوە ڕەشەکان)
هەر بە سواری تڕومبێلەوە
دەچینە دەرەوەی جەهەننەمی شارە گڕتێبەربووەکە
لە ناو ئەو هەموو بڵێسەی ئاگرەدا
لە پشت دڵپڕی شوێنێك دەدۆزینەوە
شوێنێك دەکەینە بەهەشتی بەدمەستییمان
شوێنێك لە جەهەننەم پاك دەکەینەوە
بە پارچەیەك سەهۆڵ...
ئاگری ئەو شوێنە دەکەین بە دۆشەکی نەرم
خۆڵی داخبوو دەکەینە قوڕی دڵنەرم
جەهەننەم دەخەینە ناو مەقەرەیەکی دڵڕەق
بە تکەی باڵی مریشکی بێ مەکسی و







ڤۆدگایەکی بێمنەت لە جەو و
بیرەیەکی جیرانی پەیڤی قووزەڵقورت و
نیوکیلۆ گوڵەبەڕۆژەی پاڵتۆلەبەر و
نیوکیلۆ لیمۆی دەمولێو شیرین و
نیوکیلۆ خەیاری دڵتەڕ و
نیوکیلۆ ماستی خەواڵوو و
نیوکیلۆ نیوکیلۆ نیوکیلۆ شتی تریش.
ئەو شەوە...
جەهەننەمی شار سەرخۆش دەکەین
گۆرانی بۆ جەهەننەمی بچووك دەڵێین
گۆرانیی پیاوە ڕەشەکان.

(پیاسەکان نەخۆشن)
پلەی گەرمیی شار بەرز بۆتەوە
دەمەوێت لەسەر پێڵاوەکانم بنووسم
دەمەوێت لەسەر ڕێگەکانم بنووسم
دەمەوێت لەسەر دەفتەرە شیعرییەکانم بنووسم
دەمەوێت لەسەر دیوار بنووسم:
"پیاسەکانیش نەخۆشن!"



دەمەوێت لە ناو پیاسەکانمدا بنووسم:
"پێڵاوەکانیشم ماندوون!"
دەمەوێت لە ناو ماندووبوون بنووسم:
"هەنگاوەکانیشم پڕ تاسەن!"
تاکە پێڵاوی ڕاستەم لەبەر دەرگە خەوتووە
تاکە پێڵاوی چەپەم چۆتە تەمبەڵخانە.

(تف ...!)
دەنگی گوللەیەکی تووڕە،
پێڵاوەکانم بە خەبەر دێنێتەوە
تووڕەبوونی گوللەیەك،
لە ناو پێڵاوەکەم سەوز دەبێت
پێڵاوەکەم جووتێك پێڵاوی تووڕە دەگرێت و
لەسەری دەنووسێت:
تف
تف
تف
تفەنگ.





# چوار شیعری تازەی
# واهە ئارمێن
## شاعیری ئەرمەنی - ئێرانی

( ئەم شیعرانە تا ئێستا لە هیچ کتێبێکیدا بلاّو نەکراونەتەوە)

**و. لە فارسییەوە: شادی نیکخا**

### ١

هەتا ئەو ڕۆژەی مابوو
دەستەکانی
بۆنی گوڵەباخیان لێدەهات



لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە
گوڵەباخەکان
بۆنی دەستی ئەویان لێدێ.

## ٢

حەزم ئەکرد
ئەو شەوەی کە ئەچووی
شتێکی ساکار ڕووی بدایە

ڕێگات ون بکردایە
کوکوختییەك کووکووی بکردایە و
کلیلێکی ژەنگاوی
لە هێلانەی بەتاڵی دوورناکانەوە
بکەوتایەتە خوارەوە

باران دایبکردایە
لە خەو هەستامایە
تۆم لە خەو هەستاندایە و
درێژەی ئەم خەوە
تۆ بتگێڕایەتەوە.

## ٣

ماندووە سەرباز
ئەوەندەی
کە چیتر
توانای هەڵگرتنی چەك و بەرگریی نییە

ماندووە شاعیر
ئەوەندەی
کە چیتر
توانای هەڵگرتنی پێنووس و نووسینی غەزەڵی نییە

ماندووە لێبوك
ئەوەندەی
کە چیتر
توانای لابردنی دەمامکی نییە
لەسەر ڕوخسارە لەیادکراوەکەی.





## ٤

له خەو هەستە هاوڕێم
سەیری سێن* بکە و
باسی شەڕم بۆ بنووسە
باسی دیلی
منیش لەم سەنگەرە کۆنەوە
چاوەکانم ئەنووقێنم و
باسی ئاشتیت بۆ ئەنووسم
باسی ئازادی

بالزاك ڕاستی ئەکرد
له بیرتە
وایە؟...

* سێن ڕووبارێکە لە فەڕەنسا، بە ناو شاری پاریسدا تێدەپەڕێ.



# کوڕم به هاتنت شتێکت کرد

ئەنوەر ڕەشید عەوللا

کوڕم بە هاتنت شتێکت کرد
ئەوەتا چاو لێبکە؛ بە دیار هەڵاتنی خۆتەوە ڕاتگرتم
تا شکۆفەکردنەوەی ژیان، لە دەمکەلی ئاوابووندا
بە لەونێکی تر ببینم
کە لەسەر پێستی تەڕی تۆدا



نم نم بە غەزەلی نوێوە، گوڵی پەمەیی دەرئەکات.
من کە بە تۆدا دەڕوانم
ژیان ڕووتتر دەبینم
ئەو ساتەوەختەی، بە هەموو بوونییەوە
لە سەمای سەرمەدییانەی خۆیدایەتی

کوڕم بە هاتنت شتێکت کرد
مەسەلەن؛ بە غەرقنەبوون، لە تەنهاییەکی بێبندا
بە ژێر پێوە نەبوون لەو ژاوەژاوانەی
من توانای بەرێداڕۆیشتنم نەمابوو، لایانەوە
سوپاس کە هاتی و هەڵتگرتمەوە
سەرڕێژت کردم، بە دڵی تازە

کوڕم بە هاتنت شتێکت کرد
مەسەلەن؛ کوچە بە کوچە
وەك تنۆکە بارانە دەم  بە قریووەکان
کە ڕەدووی سیمای بێسیمای با کەوتبن
مەدهۆش.. مەدهۆش، دوات کەوتم
بەو هەموو سرکییەمەوە

کە لە تۆدا سرەوتم گرت
سەوز سەوز دەچوومەوە
بڕوانە لە خەزانی ڕوخسارم
بەو هەموو ڕەنگ لێ چوونەوەی عومرەمەوە
چەند سەوزم لە تۆدا
ئەمە چ ڕۆح مەستبوونێکە
لە گوڵستانی گیانی تۆدا پێیگەییووم، ئەی ڕۆحی ڕۆح..!؟

کوڕم بە هاتنت، شتێکت کرد
مەسەلەن؛ لەسەر تەریقەتی مانگ و
بە تەگبیری تریفە
وەك شوعلەیەکی خۆشدڵ لە تاقی بڵندی شەوەزەنگدا
سوکبار.. سوکبار
منت پەڕاندەوە هەتا ئەوپەڕی پرتاوی ڕۆشنایی خۆت
دەر و دەروازەی ڕێگا گومبووەکانی گیانمت
خۆشمەشرەف.. خۆشمەشرەف
بردەوە سەر ڕاز و نیازی تەڕوبڕی نەدرکێنراوی خۆت
ئەی ئەوەی لە بێدەنگیی گێتیدا
وەك عەیش و نۆشی فەجر و
وەك موناجات و سەدای گوڵێکی تازەخەمڵیوو





بۆندار.. بۆندار
ئامادەییت هەیە لە مێرگی گیانی مندا
چ قەشەنگ ماڵە نۆماڵە بێقەرارەکەی تەنیاییمت،
لەسەر نەغمەی ژیانێکی بە لافوگەزاف ڕێك خستەوە
سوپاس.. سوپاس، سەردارم لالۆ
ئەی ڕۆحنامە تازەزاوەکەی دڵ

کوڕم بە هاتنت شتێکت کرد
مەسەلەن؛ شنەی هەناسەت وای لێکردم
ڕەوان.. ڕەوان
گوێبیستی؛ بانگی نەرمونیانی، ئەو ئایەتە نائاشنایانە ببم
کە لە میحرابی دڵە هەورییەکەتەوە
ناسك.. وەکو نەسیمێك
ڕووەو لای من دێن
بە خوو و خوڵقی بارانێکی تازە خوڵقاوەوە
شیلەی شەفەق و خۆشاوی مناڵێتیت
تەڕ.. تەڕ
بدڵۆپێنیتە؛ درزە یەکبەدوایەکەکانی ڕۆحمەوە
یەکەندەر و دەوارێکت پێهەڵدامەوە و
وەدووت خستم؛ بۆ موعتادبوونەوە بە تریاکی ژیان

ئاخر تۆ لە هەوا و هەقایەتی ؛ چ ئەفسوونێکی تری زەمانە بوویت
بۆ تەنیاییە سەرکز و پەیپێنەبراوەکەی من، باوان.

کوڕم بە هاتنت شتێکت کرد
مەسەلەن؛ بێ هیچ سڵکردنەوەیەك، وەکو هەقیقەتی ڕووتوقووتی گەردوون
بێ ئەوەی فەرامۆشم بکەیت
لەم گۆبەندی تەنیاییەدا، کە تا ناکۆتا درێژ دەبێتەوە
ژیانهێنەرانە، باوکایەتیت بەخشی بە من

ئەی گیانپەروەر.. لە نیگا گوڵڕەنگییەکانت دەپاڕێمەوە، بمبەخشیت
گەر دەستخەڕۆ و یەخسیرم کردبی
بە هەراوهوریای ئەم دنیا دەییوسەوە

چوون دەزانم باران دێت.. و
گا سەفاکار و گا جەفاکار، شەڵاڵت دەکا بە ئاینوئۆینەکانی خۆی
با دێت.. و بە خۆشمەیلی و بێمەیلییەکەوە
بۆ هێلانە دیار و نادیارەکانی خۆیت دەبا

هەر لەم هات و نەهاتییەدا؛ گریان و پێکەنینی ئاگرەکان





دێن و
دەرد و دەوای دەنگەکان دێن و
گەرمی و ساردیی ڕەنگەکان دێن و
بەرەبەیان و شەریعەتی وشەکان دێن و
لە ڕووتی و  لوغزی زەمینەوەت دەپێچن

نازانم کەی.. و نازانم چۆن
ڕووتیی با  و
ڕووتیی باران و
ڕووتیی ئاگر
هێدی.. هێدی
لە ڕووتیی تۆشەوە دەئاڵێن، کورِم

چوون هەموو لەم گەمانەدا
لەدایك بووین و
گەورە دەبین و
ئەوجا ڕووت ڕووت و تاك و تەنها دەمرین!

دوور لە گیانت
ئەمێستا؛ ژاروژەنگی ژیانی من لە پاشمەوەیە و

لێ هاژەهاژی ژیانی تۆ لە پێشەوە
بمێنەرەوە و بژی
هەتا بزانی دڵەرزین و
ئەزمونکردنی زیندەگی بە هەست و پێستەوە چی بوو..!؟

سەرەتا تف لە هیچ مەکە و
پاشان؛ تف لە هەموو شت
سەرەتا پشت لە هیچ مەکە و
پاشان؛ پشت لە هەموو شت
چاو بنوقێنە لەوەی شایەنی بینین نییە
گوێ بە شتێك مەدە، کە شایەنی بیستن نییە
بەرەنگاری گریانیش مەبەوە، ئەو حەلەی کە دەبێ بگریت
خۆت ڕزگار مەکە، کە ڕزگاربوون نییە!

دواجار وەکو گەڕۆکێکی تەنیا
گەڕۆکێکی مەست
بە دەم حەیرانێکەوە، کە لە ڕۆحتەوە بلاَچە دەکا
پەندە کۆنەکە بلێرەوە:
هەموو شتەکان درۆن
هەموو شتەکان ڕاستن





ئەوجا.. ڕووت بەرەوە لە وەهمەکانی باوکت
لە ئایینی باوکت
ڕووت بەرەوە لە گشت ئەو پۆشاکانەی
دەڵب و تەسکوتروسکن بۆ گیانی گیانت
تەنیایی تەنیاییت
سەمای سەماکانت، دڵی دڵم.. لالۆکەم.

لەندەن/ ئۆکتۆبەری ٢٠١٤



# ئەلبێر کامۆ

وەرگێڕانی

**پێشڕەو حسێن**

# یاداشتەکان

بەرگی یەکەم (١٩٣٥-١٩٤٢)

بەرگی دووەم (١٩٤٢-١٩٥١)

بەرگی سێیەم (١٩٥١-١٩٥٩)

بەرگی چوارەم (یاداشتەکانی سەفەر)












یاداشتەکان

ئەلبێر کامۆ

وەرگێڕانی

پێشڕەو حسێن



# ڕۆمانە نوێیەکەم لەحەقیقەتێکی مەزنەوە دێت

و. لە تورکییەوە: فەرهاد چۆمانی

تورکەکان و خوێنەرانی زیاتر لە **100** وڵاتی جیهان چاوەڕوانی ڕۆمانە نوێیەکەی ئۆرهان پاموك دەکەن. پاموك لەم ڕۆمانەدا چاوی وەرچەرخاندووە بۆ کۆڵانە چەپەك و هەژارنشینەکان، بە چاوی سەحلەبفرۆشێکەوە باس لەو ژیانە دەکات، کە لە تورکیا بە خێرایی گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە.

نەك تەنیا بەگوێرەی خەڵاتی نۆبڵ، بەڵکو ئەمبێرتۆ ئیکۆ موژدەی ڕۆمانێکی تازەی پاموك ڕادەگەیەنێت و دەڵێ: "دیسانەوە ئۆرهان پاموك سەرکەشییەکی دیکەی بە دەستەوەیە"، گۆڤاری هەفتانەی (**Le Point**)ی فەڕەنسی دەڵێ:

"یەکێك لە گەورە نووسەرە زیندووەکان". بۆ تورکەکانیش، وەك خۆیان دەڵێن "یەشار کەمالێکمان هەیە و پاموکێك".
شەش ساڵە خوێنەرانی چاوەڕێی دەرچوونی کتێبەکەی دەکەن و چەند مانگێکە تەواوی کردووە، وەك خۆی دەڵێت، هیچ کاتێکیش نەبووە ئەوەندە کات بۆ نووسینی ڕۆمانێکی تازەی تەرخان بکات.
ڕۆماننوسی بەناوبانگی تورکیا و وەرگری خەلاتی نۆبلی ساڵی **2006**، ئۆرهان پاموك، باسی ڕۆمانە نوێیەکەی دەکات کە بە ناوی "نامۆییەك لە سەرمدا **Kafamda Bir Tuhaflık-**" نووسیوویەتی و بە چاوی سەحلەبفرۆشێکەوە ژیانی نێو شاری خۆی، ئەو شارەی تێیدا هاتە دونیا و گەورە بوو و خەونەکانی چەکەرەیان کرد، باس دەکات.
پاموك لە ولاتەکەی هەست بە "ترسێك"ی گەورە دەکات و دەڵێ: "هەموو کەسێك دەترسێ. ئەوە دەبینم کە هەم دەیەوێ شتێك بڵێ، هەم ترسی ئەوەی هەیە لە کارەکەی دەربکرێت. ئەمە ئاسایی نییە. ڕاستە دامەزراوەی هاوشێوەی (**Freedom House**) لە دونیادا گوتوویانە، بەلام منیش دەڵێم کە: "ئازادیی ڕادەربڕین لە تورکیا لەبەرپێ کەوتووە".
چنار ئۆسکای، کۆمەڵناس و وەرگێڕ، کە ئەم دیدارەی لەگەڵ پاموك ئەنجام داوە، دەنووسێت، "ئۆرهان پاموك تەلەفۆنی بۆ کردم، گوتی، دەمەوێ یەکەم کەس ڕۆمانەکە بۆ تۆ بخوێنمەوە، تکایە کاتی پێویست بۆ ئەمە دابنێ. بەردەوام قاوەم دەخواردەوە. کەمێکیش، وەك کارێك بێت بە سەرشانمەوە، بە نائارامییەوە دەمخوێندەوە. کاتێك بەیانیی ڕۆژێك کاتژمێر شەش گەیشتمە دوماهی، نەمدەتوانی بیرۆکەی ماڵئاواییکردنی مەولود و سەمیحە قەبوڵ بکەم. دان بەوەدا دەنێم، نازانم لە دڵشکانەوە بوو، ئومێد بوو، نازانم بە هەستێکی نامۆوە بە کوڵ گریام".



**چنار ئۆسکای: ئەم ڕۆمانە دەخەیتە کوێی قۆناخی ژیانی نووسەریتەوە؟**

**ئۆرهان پاموک:** دەمەوێ وا بیری لێبکەمەوە، کە یەکێکە لە ڕۆمانەکانم، بەلام دەزانم کە وانییە.

**چنار ئۆسکای: لە چ ڕوانگەیەکەوە؟**

**ئۆرهان پاموک:** لە هەندێك ڕوانگەوە وەك ڕۆمانەکانی دیکەمە، پاڵەوانەکانم لە ئیستانبوڵ، ئەو شوێنەی کە لە هەموو شوێنێکی تر باشتر شارەزام، دەژین. بەلام ئەمجارە نیشتەجێی نیشانتاشی نین. ئەمجارە لە گردۆڵکەیەکی خەیاڵکرد، دوتتەپە، کە هاوشێوەی گردۆڵکەی



کوشتەپەیە، دەژین. یاخود لە نێوان ساڵانی **1970** و ٢٠٠٠ لە گەڕەکەکانی تارلاباشی، گازی مەحەلەسی، جیهانگیر، فەریکۆی، گوموش سویو سەحلەب دەفرۆشێت. دونیای فرۆشیاران، دونیایەك کە هەر لە دەرەوەڕا بینیوومە و بەردەوام ویستوومە لە ناوەوە لێی تێبگەم. هێزی ئەم چوار ساڵەی دواییم بە هەوڵدان بۆ چوونە نێو ئەو دونیایە و ئیستانبوڵ و بینینی ناوەوەی ئەو جیهانەم ویستووە. بۆ ئەوەی بتوانم خۆم ببەمە جێگەی پاڵەوانی ڕۆمانەکەم و بتوانم ببمە مەولود، چوار ساڵ هەوڵم دا. لە کۆتاییدا هەستی ئەوەم تێدا ڕسکا: "بەڵێ من مەولودم".

**چنار ئۆسکای: بۆچی دەتەوێ لەبارەی ئەو کەسانەوە بنووسیت؟**

**ئۆرهان پاموک:** بۆ ئەوەی باس لە وڵاتەکەم بکەم، ڕۆمان داهێنراوی چینی ناوەڕاستە، کە بەر مۆدێرنە کەوتوون، بەڵام هەموو کۆمەڵگا دەبینێ، ڕێك وەك ڕۆمانی "من ناوم سوورە"، لەوێش لە ڕوانگەی نیگارکێشەکانی سەردەمی عوسمانی لە سەدەی **16**دا ڕوانیوومەتە کۆمەڵگای ئێستا، لە بەفر-یشدا بەریەککەوتنە سیاسییەکان... بەڵام لێرە حیکایەتی سەرەکی گۆڕانکارییەکانی ئیستانبوڵە، ئەوانەی لە ئیستانبوڵ لەدایك بوون و گەورە بوون کەمێك لوتیان گرژ دەکەن و دەڵێن "لە دەرەوە هاتوون"، لە ڕاستیدا ئەوان خاوەنی شارەکەن، با سەیری ژمارەکان بکەین، ئەو کاتەی لەدایك بوون، ژمارەی دانیشتوانی ئیستانبوڵ ملیۆنێك بوو، ئێستا **15** ملیۆنە، ویستم گوزارشت لە زۆرینەی ئەو کەسانە بکەم کە لەم شارەدا دەژین.

**چنار ئۆسکای: لە هزرتدا توانیووتە ببیتە مەولود؟**

**ئۆرهان پاموک:** پێم وابوو کە بووم، پێویستە خاکەڕا بیت. فلۆبێر قسەیەکی بەناوبانگی هەیە، دەڵێ: "من مادام بۆڤاریم"، ویستم ئەو وردەکارییانە بژیم کە ئەو بینوونی، مەولود لە کۆڵانێکدا ڕێ دەکات. ئەو مەترسییانەی کە بەرەوڕووی سەحلەبفرۆشێك، ماستفرۆشێك دەبنەوە، ئەو شارەوانییەی دەری دەکات، بەڵام کاتێك من بە شەقامەکەدا دەڕۆم، یەکەم کاردانەوەم ئەوە نابێت، بەڵام وەك ڕۆماننووسێك پێویستە خۆت وا پەروەردە بکەیت کە بە چاوی پاڵەوانەکەتەوە بڕوانیتە دەوروبەر.

**چنار ئۆسکای: چۆن خۆتان ڕاهێنا؟**

**ئۆرهان پاموک:** ڕۆمانووس دوو ئامرازی هەن: یەکەم هێزی خەیاڵ، دووەم لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون. با باس لە تابلۆ فراوانەکە بکەین، کە ڕۆمان وەسفی دەکات. کۆڵانە هەژارنشینە بەراییەکانی

ئیستانبوڵ، ئەو نهۆمانەی وەسەر یەك دەنرێن، زەوییەکان، کە لە کەنارەکانی شار گەورە دەبن و شێوەی شارد دەگرن، تێکهەڵچوونەکان، دەوڵەمەندبوونی دیمەنەکە. بێگومان من لە هەموو ئەوانەدا ئەزموونم هەیە. لەو شوێنانەدا گەڕاوم، بینیوومن. بەڵام لە کۆتاییدا ئەوەی باسم کردووە، وێستگەی کارەبایە. من چووم چاوپێکەوتنم لەگەڵ سەحلەبفرۆش، ماستفرۆش، میوەی دەریایی فرۆش، شەربەتفرۆش ئەنجام دا، بە ڕاستگۆیانە بەوانم گوت: "من ڕۆمانێك دەنووسم، قسەم بۆ دەکەن". ئەو دونیایەی کە باسی دەکەم، بە قووڵی قسەم لەگەڵ ئەو کەسانە کرد کە لە نێویدا دەژین، هەندێك کەسیش بە ناوی منەوە قسەیان لەگەڵ کردوون.

**چنار ئۆسکای: ئێستا سەحلەبفرۆش ماون؟**

**ئۆرهان پاموک:** ماون.

**چنار ئۆسکای: لە شەوانی منداڵیمدا هەموو شەوێک بە کۆڵانی جیهانگیردا دەهاتن.**

**ئۆرهان پاموک:** هێشتا هەن، ئەو کاتەی ڕۆمانەکەم دەنووسی، هەرچی هاوڕێم هەبوو، پەیوەندییان پێوە دەکردم: "ئۆرهان بە کۆڵانەکەی ئێمەدا تێپەڕی" مرۆڤەکان سەرنج نادەن، من لەبەر ئەوەی ڕۆمان دەنووسم، دەزانم.

لە منداڵیشدا سەحلەبفرۆشم خۆش دەویستن. داپیرەم پەنجەرە بکاتەوە و بڵێ: "سەحلەبفرۆش وەرە سەرەوە" وەك ئەوە وابوو کەسێك لە نێو حیکایەتەکانەوە بێت.



**چنار ئۆسکای: هەندێک وردەکاریی پێکەنیناوی لە کتێبەکەدا هەن، هەندیک بەشی فیلمی پۆرنۆی تێکەوتووە، بیرم کردەوە "تۆ بڵێی ئۆرهان چووبێتە ئەو شوێنانە؟**

**ئۆرهان پاموک:** نەچووم، لەو کەسانە بیستم، کە دەچنە ئەو کولتووورە سینەماییە.

**چنار ئۆسکای: ڕۆمانەکە حیکایەتی تورکیایە. کە دەتنووسی، بیرت لە خوێنەری وڵاتانی تر دەکردەوە؟ سەحلەب چۆن بۆ سەر زمانی ئینگلیزی تەرجەمە دەکرێت؟**

**ئۆرهان پاموک:** لەو کاتەدا بیر ناکەیتەوە، ڕاستینەی چیرۆکەکە، ئەوەی پەیوەندیی بە ئێرەوە هەیە، دەتخرۆشێنێ. لە منداڵیدا سەحلەب-ت خواردووەتەوە، هێزی خەیاڵت بە ئاستێکی بەرز دەخەیتە گەڕ، بەڵام کاتێك چیرۆکەکە کۆ دەکەیتەوە، بیر لە لایەنی جیهانگیرییەکەیشی دەکەیتەوە.

پایتەختی دونیا: ئیستانبوڵ

**چنار ئۆسکای: لە پەرەگرافی یەکەمی کتێبەکەتدا بەشێک هەیە "لە**



**تەمەنی ١٢ ساڵیدا هاتە ئیستانبوڵ و دواتریش هەر لەوێ، لە پایتەختی دونیادا ژیا" ئایا ئیستانبوڵ پایتەختی دونیایە؟**

**ئۆرهان پاموک:** ئیستانبوڵ و ئەم ڕۆمانەش شایانی ئەو ڕستەیەن. هاتە بەر نووکی قەڵەمەکەم، ڕستەیەکی لەخۆباییانەیە، بەڵام سوپاسگوزارم کە نووسیم.

نامەوێ ڕوونی بکەمەوە بۆچی نووسیم، وا هەست دەکەم، کە لە ژیانی کەسیی خۆمدا گرنگە. فلۆبێر لە ساڵی ١٨٥٠ کە هاتووەتە ئیستانبوڵ، زۆر نامەی نووسیوون، "ڕۆژێك پایتەختی دونیا ئەم شارە دەبێت". فلۆبێر بە هەڵەدا چوو. دوای ٥٠ ساڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کەوت. لە ١٠ ساڵی کۆتایی عوسمانییەکان ئەو میترۆیەی دروست کرا، یەکەم میترۆی دونیا بوو، ئەگەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گەیشتبووایەتە سەرمایەداری، ئەو میترۆیە شتێك دەبوو هاوشێوەی میترۆی پاریس. حاڵ وابوو کە من هەموو منداڵیم لەوەدا بەسەر ببەم بڵێم "ئەها لە خۆرئاوا میترۆ هەیە، لای ئێمە نییە". بەڵکە ئەو شەیداییە لە منیشدا نەماوە، ١٠ ساڵ پێش ئێستا نەمدەتوانی ئیستانبوڵ بە پایتەختی دونیا ناو بنێم، بگرە پێکەنیناویش دەبوو، بەڵام ئێستا بە کەمێك شانازییشەوە دەنووسم.

**چنار ئۆسکای: لە ڕۆمانەکەدا تەکنیکێکی زۆر جیاواز هەیە، نزیکەی ١٠ کاراکتەر دێنییە ئاخاوتن، ئایا ئەمە ڕێبازێکی باوە؟**

**ئۆرهان پاموک:** نەخێر، یەکەم کەس من کردم و کاری کرد. لە مۆزەخانەی پاکیزەییدا چیم کرد؟ ڕۆمانێك و مۆزەخانەیەك.. بۆ یەکەم جار.. شتێکی زۆر باڵا نییە، بەڵام بە شێوەیەکی بێفیزانە ئەوەی لە دەستم هاتووە، گوتوومە.

**چنار ئۆسکای: لە ڕۆمانەکانی دونیا ئەمە هەیە؟**

**ئۆرهان پاموک:** نییە، کاتێك مۆزەخانەی پاکیزەییم دروست کرد، دەیانپرسی "مۆزەخانەیەکی لەم شێوەیە هەیە؟"

**چنار ئۆسکای: ئەمە ناوێکی هەیە؟**

**ئۆرهان پاموک:** نا نیەتی، ئەگەر دەتەوێ، با ئێستا بەیەکەوە ناوێکی بۆ بدۆزینەوە.

**چنار ئۆسکای: وەک ڕۆمانێکی دەنگی جیاواز، بە ڕای من زۆر دەوڵەمەندکراو.**

**ئۆرهان پاموک:** بەڵێ دەمەوێ درێژەی پێبدەم.

**چنار ئۆسکای: ئەگەر وەک ژنێک هاتبایتە دونیا، ژیانت چۆن دەبوو؟**

**ئۆرهان پاموک:** لە تورکیا ژمارەیەکی زۆر لە ژنەنووسەری درەوشاوەمان هەن.

**چنار ئۆسکای: باشە؛ بۆ تۆ کارەکە جیاواز دەبوو؟**

**ئۆرهان پاموک:** ڕەنگ بێ بەم شێوەیە بووایە: لە گەنجێتیمدا خۆمم نەدەپاراست، دیسانەوە بە ماڵباتەکەم دەگوت "دەبمە ڕۆماننووس" ئەگەر کچ بووایەم، ئەمەم نەدەکرد.

**چنار ئۆسکای: بەرەنگار نەدەبوویتەوە؟**

**ئۆرهان پاموک:** بەڵێ، بەرەنگار نەدەبوومەوە.

**چنار ئۆسکای: ئەم ڕۆمانەش تەواو، نۆرەی چییە؟**

**ئۆرهان پاموک:** هەستێکم وام هەیە بەوەی کە کەموکورتییەکم هەیە، وەك ئەوەیە نەتوانم ڕۆمانی کورت بنووسم، بە نزیکبوونەوە لە تێڕوانینی منداڵێك دەمەوێ ڕۆمانێکی کورت بنووسم، خۆشم بە تەواوی نازانم چی دەبێت.

**چنار ئۆسکای: مەبەستت ئەوەیە کە پاڵەوانەکەی منداڵێک بێت؟**



**ئۆرهان پاموک:** دونیای مێردمنداڵێك، گەورەبوونی، دەمەوێ شەڕەکانی لەگەڵ باوکە خەیاڵی و ڕاستەقینەکەی بنووسمەوە. مێردمنداڵێك لە تەمەنی ١٦-١٧ ساڵان، سێکس و تێپەڕاندنی قۆناخی مێردمنداڵی. دەمەوێ ئاریشەکانی بنووسمەوە.

**چنار ئۆسکای: سروشێکە لە کچەکەتانەوە وەرتان گرتووە؟**

**ئۆرهان پاموک:** نەخێر، هاوینان بە هۆی کێشەی نەبوونی پارەوە جابی بێت، بەڵام هێندەی مەولود هەژار نەبێت، منداڵێکی چینی مامناوەند بێت.

**چنار ئۆسکای: ئێتر دەتوانم پرسیارە بنەڕەتییەکەم بکەم: "نامۆییەک لە سەرمدا" دەکرێ ببێتە بەهێزترین ڕۆمانت؟ دواجار توانیووتانە "کتێبی ڕەش" تێبپەڕێنن؟**

**ئۆرهان پاموک:** من نازانم، برۆ ئەم پرسیارە لە کەسانی دیکە بکە، بەڵام ئەو ڕووبەرەی لە خۆی دەگرێت، ویستی چوونە نێو جۆراوجۆری مرۆڤەکان و دەوڵەمەندییەکەی، ئەو لێکۆڵینەوانەی پشتی پێبەستوون، ئەو کاتەی



پێم بەخشیووە و ئەو هێزی خەیاڵەی پێم بەخشیووە، زۆر شت لەم ڕۆمانەدا خەرج کراون، بڕوام بە مرۆڤایەتیی نێو ڕۆمانەکەم هەیە. لە حەقیقەتێکی مەزنەوە دێت، لە دەنگەدەنگی شارەوە، بە بیستنی دەنگی هەر ١٢ ملیۆنەکەوە نووسیومە، هەموو حیکایەتەکانی ناوی خەمگینن، چ بازرگانی، چ سیاسی و چ مرۆڤانە بن. خەمگینییەکانیان، گۆڕانکارییەکانیان، نوێبوونیان لە هیچ شوێنێکی دیکەی دونیادا نین. بەڵام نامەوێ لەگەڵ ئەوانی دیکە تێکەڵیان بکەم. ڕۆمانەکانم منداڵەکانی منن. بۆ پەسندانی منداڵە نوێیەکەم لەگەڵ ئەوەی دیکە بەگژ یەکیاندا نادەم. دیسانەوە هۆشیاریم بەوە هەیە کە منداڵێکم هەیە، کە ڕێگای لە بەردەمدا کراوەتەوە.

**چنار ئۆسکای: ژمارەیەکی زۆر لە خوێنەرت هەن، هێندەی ئەوانیش کەسانێک کە خۆشییان لێت نایەت.. بە داخەوە، ڕەخنە لای ئێمە دەستی ناوەتە دەستی نەفرەتەوە، چۆن دەتوانی ئیدارەی ئەمە بدەی؟**

**ئۆرهان پاموک:** ناتوانم بڵێم ئیدارەم داوە، ناتوانم بیدەم، قسەیەکی کلێشەیی هەیە لە تورکیا "داری بەردار بەردی تێدەگرن". ئەمە لایەنی سیاسیشی هەیە، بۆ نموونە، نایانەوێ باسی کۆمەڵکوژیی ئەرمەنەکان بکرێت، نایانەوێ گوێیان لێبێت. حەقیان پێدەدەم، لەوە ناڕازی نیم، بەڵام ئەوەی حەقی پێنادەم، بەخیلیی پیاوانە، بەتایبەتی ئەوانەی هاوتەمەنی خۆمن. ئەوانەی دەیانەوێ بانگەشەدار و ببنە کەسانی گرنگ، سەرەدەریکردن لەگەڵ بەخیلییەکەیان سەختە، خراپترینیشی ئەوەیە، ماسکێکی سیاسی دەخەنە سەر و کاریگەریخستنە سەر خەڵکە.

سەرچاوە:

http://www.hurriyet.com.tr/kelebek/keyif/27720162.asp

# من هەرگیز کەسێکی سیاسی نەبووم

**سازکردنی: ئەلێکساندەر ستار**
**و. لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف**

**لە ڕۆمانەکەتدا "بەفر" تورکیا وەک وڵاتێکی کەمێک نامۆ دەردەکەوێت، بە جۆرێک ناسیۆنالیستە عەلمانییەکان و پیاوانی ئایینی لە ململانێدان بۆ سەپاندنی ئەوەی پێی دەوترێت ئەو ئایدیایانەی کە گومان لە یەکسانبوون دەکەن و چۆن وا لە خەڵک بکرێت ئازاد بن. ئایا ئەوە تورکیایە کە تۆ باسی دەکەی؟**

**پامۆک:** دەزانی، ئەو بۆشاییەی لە نێوان ئاگایی کارەکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکانی من و ئەو ڕاستییە شیعرییەی لە وڵاتدا هەیە، هەرچۆنێك بێت، گرژییەك بەرهەم دێنێت، کە گرنگیی خۆی هەیە. من ویستوومە ئەو دوو جیهانە بنووسمەوە وەك ئەوەی کە هەن. جیهانبینیی ڕۆشنبیرانی بەخۆرئاوایکراو لەو زاراوەگەلانەوە دێن، کە لە هەژارترین و پەراوێزخراوترین و هەرچۆنێك نەخوێندەوارترین چین و توێژ هەیە باس بکات. هەروەها تووڕەترین چینی خەڵك ببینێت.

**ستار: کێشەی سەرەکی لە ڕۆمانی بەفردا ئارەزووی هەندێک ئافرەتی موسوڵمانە بۆ پۆشینی لەچک بۆ قوتابخانە. مەسەلەکە ئەوەیە کە پرسیارگەلێکی هەستیار سەرهەڵدەدات لەبارەی ئەو هێڵەی لەو نێوەندەدا کێشاوتە: تۆلێرانسی ئایینی یان ناچاریی ئایینی. ئەوەی بە گەرمی لە ئێستای حکومەتی تورکیادا هەیە و پێشتریش؛ هەوڵ هەبوو بۆ یارمەتیدانی سیستەمی پەروەردە لە قوتابخانە ئایینییەکاندا. تۆ پێت وایە پاڵنەرێکی قانونی بۆ ئەوان لەئارادا بێت؟**

**پاموک:** سەیرکە، من نووسەرم. کەمن هەوڵ دەدەم لەسەر ئەو مەسەلانە بنووسم، لەبەر دید و تێڕوانینی پیاوانی دەوڵەت نییە، بەڵکو لەبەر دید و تێڕوانینی کەسێکەوەیە، کە هەوڵ دەدات لە خەم و ئازارەکانی ئەویتر بگات. من پێم وایە هیچ میتۆدێك نییە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە. هەر کەسێك پێی وابێت چارەسەری سادە بۆ ئەو کێشانە لەئارادایە، بە ڕاستی گەمژەیە. هەرچۆنێك بێت، بوون بە بەشێك لەو کێشانە بە زوویی کۆتایی دێت. من پێم وایە ئەدەب دەتوانێت ڕێگەخۆشکەر بێت بۆ ئەو کێشانە، لەبەر ئەوەی ئێمە لە هەرێمێکی تەواو گومانلێکراودا دەژین، لە ناوچەیەکدا، کە کەس ڕاست نییە و کەسیش مافی ئەوەی نییە بە ڕاستی بدوێت. هەر ئەمەیە وا دەکات کە نووسینی ڕۆمان گرنگ بێت. هەر ئەمەشە وا دەکات کە بەر لە ژانرەکانی تر نووسینی ڕۆمانی سیاسی لە ئەمڕۆدا گرنگ بێت.

**ستار: لە ئێستادا ڕۆمانی تۆ تەعبیر لە زۆرێک لە نیگەرانی دەکات بۆ تێگەیشتنێکی تەواو لە خەمباری و ئابڕووتکاندنی خەڵک، کە لە شوێنە جیاوازەکاندا دەژین.**

**پاموک:** من بە شێوازێکی ڕۆحی و ئەخلاقی لە کارەکتەرەکانمەوە نزیکم. کاتێك ئەوان لە هەژارترین توێژی کۆمەڵگەی تورکین؛ هەربۆیە زوو دەکەونە تەڵەی دنیابینیی من و قسەکردنمەوە بە ناوی ئەوانیترەوە، بەتایبەتی هەژارترینیان. ئەو کەیسانە بە تەواوی کێشەئامێزن. لە ڕاستیدا هەندێ جار کۆتایی بە بوونێکی نامۆراڵی دێت: کێشەی تەعبیرکردن لە هەژاران، پەراوێزخراوان، تەنانەت لە ئەدەبیشدا بە شێوەیەکی مۆراڵی گومانلێکراون. لەبەر ئەوە، لە ڕۆمانی سیاسیدا ئەگەر کەمێك بایەخم بەوە دابێت، ئەگەر کەمێکیش بێت، من جۆرێك لە بێفیزیم پێوە دیارە. ئەمەش گەر کەمێك ئاوڕ بدەینەوە و سیمبوڵی کێشەکە ببینین، کە بەشێکە لە ئەدەب

ستار: چۆن بوو بڕیارتان دا ڕۆمانی سیاسی بنووسن؟





**پامۆک:** لە بیست ساڵی ڕابردوودا کە ڕۆمان دەنووسم، هەرگیز کەسێکی سیاسی نەبووم. نەوەی پێشووی نووسەرانی تورکیا سیاسی بوون و بە شێوەیەکی ئەخلاقی زۆر سەرسام بوون بە سیاسەت. ئەوان بە شێوەیەکی بنەڕەتی دەیاننووسی وەك ئەوەی نابۆکۆف **1899ـ1977** بە کۆمێنتاری کۆمەڵایەتی ناوی دەبردن من ڕاهاتبووم بڕوا بێنم، تەنانەت ئێستاش بڕوام وایە کە ئەم جۆرە لە سیاسەت هیچ ناکات جگە لە کوشتنی هونەری نووسین. بیست ساڵ پێش ئێستا، بیستوپێنچ ساڵ پێش ئێستا من بڕوایەکی ڕادیکاڵم هەبوو بە تەنها وەك ئەوەی هێنری جەیمس **1843ـ1916** سەبارەت بە هونەری ڕۆمان هەیبوو. بەڵام دواتر کاتێك شارەزا بووم، لە ناوەوە و دەرەوەی تورکیا خەڵك دەستیان دەکرد بە پرسیارکردن لەبارەی سیاسەتەوە و خوازیاری کۆمێنتەری بوون لەسەر سیاسەت. لەبەر ئەوە، بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە هەستم بەوە دەکرد، کە دەوڵەتی تورکیا دیموکراسی و مافی مرۆڤ و وڵات بە تەواوی وێران دەکات. بۆیە ئەو شتانەم لە دەرەوەی کتێبەکانم دەکرد.

**ستار: شتی وەک چی؟**

**پاموک:** نووسینی سکاڵا و ئامادەبوون لە کۆبوونەوە سیاسییەکان، بەڵام کۆمێنتارییەکانم بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە دەرەوەی کتێبەکانم بوون. ئەمەش کەمێك ناوبانگی خراپ کردم. من زۆر گرنگیم دا بە جۆرێك لە شەڕی سیاسی لەدژی دەوڵەتی تورکی و دامەزراوەکان، کە لە دە ساڵی ڕابردوودا زیاتر بەشێك بوون لە ناسیۆنالیستەکان. هەرچۆنێك بێت، من بە خۆم دەوت بۆچی ڕۆمانێکی سیاسی نەنووسم تاکو هەموو ئەمانە لەسەرشانی خۆم لابەرم؟

**ستار: ئایا ئێوە لە بڵاوکردنەوەی ڕۆمانی "بەفر" کێشەتان بۆ دروست بوو؟ ئەو ڕۆمانە لە لایەن ئیسلامییەکان و ئەوانی ترەوە چۆن پێشوازیی لێکرا؟**

**پامۆک:** پێش بڵاوبووەنەوەی کتێبەکە، بە هاوڕێ و خاوەن چاپخانەکەم وت، کە ڕۆمانێکی پاراوی سیاسیم تەواو کردووە. دەتوانم پیشانی پارێزەرانی بدەم؟ ئەوان وتیان نا نا نا، ئێستا تورکیا خوازیارە لە یەکێتیی ئەورووپا وەرگیرێت و تۆش ئێستا لە ناوەوە و دەرەوەی تورکیا ناسراویت، بۆیە پێویست بەوە ناکات. ئۆکەی، پاش ماوەیەك کتێبەکەم بە چاپخانەکە بەخشی. وتم ئەوە کتێبەکەم. دوای هەفتەیەك تەلەفۆنیان بۆ کردم و وتیان کتێبەکەمان خوێندۆتەوە و زۆر بەدڵیانە، بەڵام پێویستە

ڕێگەی بڵاوکردنەوەی پێبدرێت و پیشانی پارێزەرێك بدرێت. ئەوان قەلەق بوون بەوەی کە بڵاوکەرەوەی کتێبەکەم کەیسێکی کراوە بکاتەوە یان کتێبەکەم لە بڵاوکردنەوە دوور بخاتەوە. چاپی یەکەمی کتێبەکەم سەد هەزاری لێ کۆپی کرا. ئەوان بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەبارەی لایەنە ئابوورییەکەوە لە دڵەڕاوکێدا بوون. بۆ نموونە، کتێبەکەیان لە سوچێکدا شاردەوە، کە ئەگەر دوور بخرێتەوە، بتوانن چەند کۆپییەك بۆ خۆیان ببەن. بەڵام هیچ شتێك لەم شتە سلبییانە ڕووی نەدا. لە ڕاستیدا وڵات بە مەترسییەوە مشتومڕیان لەسەر کتێبەکە کرد. نیوەی ئیسلامییە سیاسییەکان و خەڵکانێك لە پشتەوەی سوپاوە بوون، هێرشیان کردە سەرم. هەرچۆنێك بێت، من زیندوو بووم. هیچ شتێك بەرامبەر بە من ڕووی نەدا. لە ڕاستییشدا هیوام خواست شتەکان باش بڕۆن. هەندێك لە ئیسلامییە ڕادیکاڵەکان بە دیدگەلێکی تەواو بنەڕەتییەوە ڕەخنەیان لە کتێبەکەم گرت، بۆ نموونە دەیانوت: "تۆ هەوڵی ئەوەت داوە باسی ئیسلامییەکان بکەی، بەڵام خۆت ئەوە دەزانی کە ئیسلامییەکان هەرگیز بەبێ ئەنجامدانی هاوسەرگیری سێکس ئەنجام نادەن". لە لایەکی ترەوە، زۆرێك لە ئیسلامییە ڕادیکاڵەکان دڵخۆش بوون بەوەی لانی کەم وێراومە قسە لەسەر سوپای تورك بکەم و هەراسانیان بکەم.

**ستار: ئەو کاتەی جۆرج بوش بۆ لوتکەی وڵاتانی ناتۆ لە ئەستەمبوڵ بوو، باسی تۆی کرد وەک "نووسەرێکی گەورە" کە یارمەتیدەر بووی بۆ بنیادنانی پردی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا. قسەکانی ئەو لەسەر لێکچوونی خەڵکی جیهان بوو، ئەو بەرگریی لە هەوڵەکانی ئەمریکا دەکرد بۆ یارمەتیدانی خەڵک لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست تا چێژ لە مافە بنەڕەتییەکانیان ببینن لە ئازادی. تۆ ڕات وایە کە جۆرج بوش لەوە گەیشتووە کە تۆ مەبەستت چییە؟**

**پاموک:** پێم وایە جۆرج بوش بۆشاییەك لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا دادەنێت، ئەویش بە شەڕ. ئەوە وای کردووە کە کۆی کۆمەڵگە موسوڵمانەکان بەبێ هۆ لە ئەمریکا و تەنانەت خۆرئاواش نیگەران بن. ئەمەش ڕێگە خۆش دەکات بۆ ترس و پێکادانی دڵڕەقانە و ئازاری بێبەهانە بۆ زۆرێك لە خەڵك. بەمەش ترس و دڵەڕاوکێ لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا زیاد دەکات. ئەمەش ئەو شتانەیە کە من هەرگیز ئارەزووم نەخواستووە ڕوو بدەن. من لە کتێبەکانمدا هەمیشە گەڕاوم بە دوای جۆرێك لە خۆگونجان (**harmony**) لە نێوان ئەوەی پێی دەڵێن خۆرهەڵات و خۆرئاوا. بە کورتی، ئەوەی کە








سالآنێکە نووسیوومن، بە هەڵە وەرگیراوە. وەك جۆرێك لە پاڵپشتیکردن لەوەی کە ڕووی داوە، بەکار هێنراوە. یان ئەو شتە دڵڕەقانەیەی کە ڕووی داوە.

**ستار: ئایا ڕۆمان ئەوەیە کە وەک فۆرمی شتێک کە تۆ وەک کەرەستەیەکی زیندوو تێی بڕوانی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، یان بە شێوەیەکی فراوانتر لە وڵاتانی دەرەوەی خۆرئاوا؟ بە مانایەکی تر، تۆ هەستت بەوە کردووە کە شتێکی تەواو نامۆت بەرهەم هێناوە؟**

**پاموک:** نەخێر. هونەری ڕۆمان هونەرێکی پێرفێکتە، زیندووە، تەواو سەرکێش و جیرە(**elasticity**). من دڵنیام لە خۆرئاوا، بە ئەمریکا و ئەوروپاشەوە، بە زیندوویی دەمێنێتەوە. بەڵام لە ئاییندەیەکی نزیکدا لە وڵاتانی وەك چین و هیندستان تەواو نامۆ دەردەکەوێت، کە لە ئێستادا لەو شوێنانە بە شێوەیەکی بێوێنە چینی مامناوەند سەرهەڵدەدات. پیشاندانی دەسەڵاتی ئەو چینە مامناوەندە نوێیانە لە چین و هیندستان کێشەگەلی ناسنامە(**identity**) دروست دەکات. ئەمەش ناسیۆنالیزم تووش دەکات، لە کاتێکدا ئەوان ڕووبەڕووی جیاکاریی ناسنامە دەبنەوە لە ئەوروپا و خۆرئاوا، بیری خۆرئاوایی ڕووبەڕووی شەڕی سەختی خەڵکانی هەژار دەکاتەوە. من پێم وایە ڕۆمانی نوێ لە خۆرهەڵاتەوە بەرهەم دێت، لە بەشێکی ئەم جیهانەوە جارێکی تر سەرهەڵدەدات و جیاوازیی لە مۆدێرنیتیی خۆرهەڵات ـ خۆرئاوا و سروشتی پشتپێنەبەستراو بۆ سەرهەڵدانی چینە مامناوەندەکان لە چین و هیندستان تەنانەت لە تورکیاش دروست دەکات.

**ستار: لە ڕۆمانی"بەفر"دا کارەکتەرێکی ڕادیکاڵی ئیسلامی وەک (شینە) تیبینی دەکرێت وەک یەکێک**

**لەو خاڵانەی کە ئەمریکا وەک باشترین شت بە جیهانی بەخشیووە، ئەویش ڕێد مارلبۆرۆیە. بۆ ئەم تێبینییە کۆکی لەگەڵم؟**

**پاموک:** من کاتێك گەنج بووم، جگەرەم زۆر دەکێشا. ئێمە چێژە شەخسییەکانمان لە نێو کارەکتەرەکانماندا دابەش دەکرد. ئەمەش ئەو شادییەیە، کە لە نووسینی چیرۆکدا دەیبینین.

سەرچاوە:

http://www.orhanpamuk.net/popuppage.aspx?id=24&lng=eng







لاوەند حەمید حەسەن

ئەلفۆنس دۆدێ

مەحمود نەجمەدین

ئاوات غولامی

# چیرۆک
# ئەدەبی سەردەم

ئەدەبی سەردەم ٦٧



# شارێك لە باشوور

لاوەند حەمید حەسەن

ڕەنگە یەکێك لە وڵاتێکی ساردوسڕدا ئەم قسانە ببیستێ سەری بسووڕمێ. بەڵام با بێت ڕۆژێك وەك من بژی و خۆی شایەت بێت. بزانێت کە گەرما و تەپوتۆز و بێسێبەری چیی لێکردووم؟... تەنیا چیی لە من کردووە، نەك خەڵکی تر. خەڵکی تر کێشەی نییە. تەنیا دەسڕێك دەرئەهێنێت و ناوچەوانی ئەسڕێت و ئەڵێ دەی هەر ئەم چەند مانگەیە... ئەو کاتە حەقم پێئەدات و وەك برادەران بە گلەیی نامشواتەوە و تۆزێك حەقم بە بەرەوە ئەهێڵێتەوە... هەموو جارێك ئەڵێم ئەم وڵاتە سێبەری نییە، بۆیە بەو جۆرە لە یەك تووڕەین. لە فیلم و پۆستەرە ڕەنگاوڕەنگەکانی سەری ساڵدا ئەمبینی، یانیش جاروبار خزم و کەسوکار لە وڵاتێکی ساردەوە وێنەیان ئەناردەوە و ئەمبینی ئەوێ چەند پڕە لە سێبەر، چۆن لە شەقامەکانیان بەبێ داریش سێبەری ئەستووری ڕەش ڕوواوە. ئەو بێسێبەرییەی ئێرەش هێندە تووڕەی کردووم، کە تەنانەت ئەگەر ناوی وڵاتەکەش نەزانم و نەزانم لە چ قاڕەیەکە، بەڵام ئەڵێم ئایا وڵاتێکە سێبەری هەیە یان نا؟

سنوور ناناسم. تەنیا لای من دوو جۆر جوگرافیا هەیە، یەکێکیان بەر نەفرەتی بێسێبەری کەوتووە، ئەوەی دیکەشیان هەوا ئازادە و سێبەری بێشوماری لێیە... هەرچەندە ئەمە باسەکە نییە، باسەکە ئەوەیە بەو گەرما و بێسێبەرییە (جگە لە سێبەری گەرمی جەمەلۆنەکان) ئەبوو بچم بۆ شارێکی تر، کە چەند سەعاتێك لە شارەکەی ئێمە باشوورتر بوو...



نیوەڕۆیەك بە زەردییەکی تۆقێنەرەوە چوومە گەراج و ئەو پاسەش کە بەرەو ئەو شارەی ئەبردین، کە بۆ ئەو شارە ئەڕۆشت، چاوەڕوانی پڕبوونی سەرنشینەکان بوو. دیار بوو ئەبوو چاوەڕوانییەکی باش ئازار بچێژین لەو گەرمایەدا... وەنەبێ شۆفێرەکەش بزانێت کەسێك هەیە گەرما هەلاهەلای کردووە. دوای ئەوە، خۆشی لە ژورێکدا کە دیوارەکانی گەچکاری نەکرابوو و هێشتا هەر بلۆکێکی وشك بوو، بە دیار موبەریدەیەکی دەنگنووساوەوە لەگەڵ کۆمەڵێك شۆفێری تردا خەریکی گاڵتەوگەپی بێتام و دۆمینە بوون. جارجارێکیش پەردەکەی لائەبرد تا بزانێت پاسەکە پڕ نەبووە... من لە پاسەکەیدا شوێنێکم دۆزییەوە، کە لە لای پەنجەرەوە بێت... نازانم لای ئێوە چۆنە، بەڵام یاسایەك هەیە لای من، کە موورادیفی لوتکەی قێزلەخۆبوونەوەیە، ئەویش سەفەرکردنە بە پاسێکی بێفێنککەرەوە لە گەرمایەکی تۆقێنەردا بەرەو شارێکی باشووری لە نیوەڕۆیەکی تەمووزدا... ئۆە، تەنانەت بە ڕستەش هەست ئەکەی ڕستەیەکی داخە... خۆ ڕەنگە تا ئێرە باسەکە بە ئاسایی وەرگرن و بڵێن ئەمە شەڕی شتی ترە بەو گەرمایەی ئەفرۆشێت، بەڵام باشە ئەی ئەگەر سەرنشینێکی بەتەمەنی دانزەرد لە تەنیشتتەوە دابنیشێت و بۆنێکی خەستی جگەرە و چای لێبێت و داوات لێبکات کە جێگاکەی خۆتی بدەیتێ، چونکە ئەویش حەزی لەوەیە کە لای پەنجەرەوە دابنیشێت؟ هەر ئاسایی وەری ئەگرن؟ یان پیرێژنێکی ماندوونەناس بە خاوەخاو سوار ئەبێت و بەشی زستانێکی سارد خۆی داپۆشیووە و هەست ئەکەیت ئەوەی تۆ ئەیڵێیت، ئەو قەت تێی ناگات وەك بڵێی خەڵکی هەسارەیەکی ترە... بۆ ئەمەش هەر ئاسایین ئێوە؟ یان لە هەمووی دڵتەزێنتر، کە هەست ئەکەم ئیتر ڕازی بن لەگەڵم، ئەویش ئەوەیە کە مناڵێك بە سینییەك پاقلاوەی شیرین شیرینی نەبرژاوەوە بە وەزن و قافیەوە هاوار بکات بۆ فرۆشتنی و لە هەمووشی ماندووکەرتر چەند سەربازێك ببینیت کە زیاد لە سەعاتێك چاوەڕێی هاتنی ئەو منداڵە ئەکەن، تا بە خۆشحاڵییەوە سەروچەند پاقلاوەیەکی لێبکڕن و بە شەربەتێکی گەرمەوە لووشی بەن... پێم وابێ ئیتر ئەمە ئاسایی نییە... ئەوانەی من بینیم، ماکیاجکردنی ئەو دیمەنە گەرمە دۆزەخییە بوو بە ماکیاجێکی دۆزەخیتر... خۆم پێناگیرێ و هێڵنجم دێت... ئەمەوێت دابەزم بچم ئاوێك بە دەموچاومدا بکەم، بەڵام تەمەڵییەکی قورس گرتوومی... نە ئەتوانم بڕۆم نە دانیشم... چاو دائەخەم، حەزم بە ڕشانەوەیەکی زۆر قووڵە بە جۆرێك کە بمەوێت ڕیخۆڵەم لەگەڵی بێتە دەرەوە، بەڵام تەمەڵییەکەم زۆرترە... ئەمەوێت چاو داخەم و تەکنیکێکی سایکۆلۆجی بیر خۆم بخەمەوە،

که لەو کتێبە دەروونشیکارییە هەرزانبابییانەوە فێر بووم، کە بە حساب وێنای ناخۆش بگۆڕێت بۆ دیمەنی جوانتر، بەڵام هەست ئەکەم هەموو شتێك لەگەڵ ئەو گەرما و تەمەڵییەدا بێمانایە، یان ڕاستتر بڵێم، قسەی قۆڕە! ئەزانم تازە نەمئەتوانی هیچ وێنایەك بخەمە سەرمەوە، بەڵام ویستم هیچ نەبێت بیهێنمە بەرچاوم کە سەرما چۆنە؟ بەفر کە بەر لەش ئەکەوێت، چ هەستێك داتئەگرێ؟ هیچم بیر نەمابوو...هیچ ...هیچ...

هاتن پارەکەیان لێ وەرگرتین و بەوە دڵم کۆڵێك خۆش بوو و زانیم ئیتر ئەڕۆین... ئەو ڕاوەستانە کۆنکرێتییە منی پارچەپارچە کردبوو... ئێستا تەنیا یەك هیوام هەیە، کە پاسەکە ئەکەوێتە جووڵە و لە جامی نیوەکراوەوە تۆزەهەوایەکی داخ دێتە ژورەوە. هەرچەند لەسەدا سفری ئەوەی پێی ئەوترێ فێنکی، لە هەوادا نەمابوو، بەس گرنگ بجووڵێین و من لەم شوێنە قێزەونەدا نەمرم... کە خەریکیش بوو هەناسەم بۆ نەئەدرا...

کاتی بانگدان گەیشتمە ئەو ناونیشانەی کە بۆی چووم و لە ماوەی ئەم چەندساڵەدا چەندەم جارمە... دەرگایەکی تەنگ و نزم. دەرگام کوتی و پیرێژنێکی داپۆشراو بردمیە ژوورەوە و بە ڕاڕەوێکی درێژدا چوومە حەوشەیەکی گەورە. لەوێ کەمێ وەستام هەتا (ئەبو ڕەعد) ئەمجارە یەکێکی تری نارد بە شوێنما و دوای کەوتم... بە ڕاڕەوێکی تاریکی تردا منی برد و ئەمجارە دەرگا نەبوو، تەنیا ئەکرێت وا وەسفی بکەیت کونێك و پەردەیەکی سەوزی پیادراوە، کە من سەرەتا نەمزانی سەوزە، بەس دواتر کە ئاگرەکە ڕووناکی کردەوە، ئینجا بینیم... پەردەمان لابرد و چووینە ئەودیوەوە بۆ باخێکی گەورە... دارستان... جەنگەڵێك لە دارخورما کە تا ئەو ساتە باخی وا گەورەی خورمام نەبینیبوو... هەستم بە فێنکییەك کرد... باخوباخاتێکی چڕ بوو. ئەگەر بۆنی ئەو چێشتە زۆرە پڕ بەهاراتانە نەبووایە، بە ئاسانی بۆنی دارپرتەقاڵەکان ئەکرا... دانیشتین و ئەبوو ڕەعد بە گوێی کچێکدا چرپاندی و کچەکە بە پێکەنینەوە بەرەو ڕووی من هات و لە باوەشمدا دانیشت و دەستی کرد بە ماچکردنم. منیش ئەوەم ئەویست. ئەمەش زیاد ئەکەم و بە ئێوەی ئەڵێم و ئێوەش کەیفی خۆتانە... ئەزانم حوکمی خۆتان ئەدەن وەك هەمیشە... دەی بە قسە توندەکانتان وەك هەمیشە حوکمم بدەن... ئەسڵەن کوا گوێم بەوە داوە؟ یان بۆ خۆتان وا نین؟

ویستم ئەوە بڵێم ئەو ئافرەتانەی ئێوە پێی ئەڵێن قەحبە، من خۆشم ئەوێن. ئەزانم ئەوانیش هەندێ جار بە هۆی ناچارییەکانی ئێوەوە خۆیان قەحبە ئەکەن، بەڵام بەگشتی





قەحبەکان ئافرەتی باش و بەئابڕوون... خۆشم ئەوێن، چونکە دوای سێکس ئەبن بە حیکایەتخوان... هەندێکیش لەو لەشفرۆشانە هەن، کە جارجار وەك ئەستێرەیەکی کشاو ئەکشێن و ئەڕۆن و قەت ناگیرێن. ئەوانە ترسناکن... ناسکترین ئافرەتی دونیان. هەموو قەحبەکان ناچار کراون ئەو کارە بکەن، بەڵام ئەوانەیان، وەك وتم کە وەك ئەستێرەی کشاون، خۆیان ئەو کارەیان هەڵبژاردووە، چونکە موڵکی پیاوێك نین... هی زۆر کەسن... بە یەك کەس ناگیرێن... ئا ڕێك وەك ئەستیرەی کشاو لە ئاسمانیکی ڕوونا... لەناکاو خورپەیەك لێت ئەدا... بە خۆت ئەڵێیت برۆ بیگرە و هەموو شتێك بەجێ بهێڵە... بەشێکی تر هەر لە ناو خۆتدا پێت ئەڵێت (واز بێنە، ئەوە قەحبەیە و بۆ تۆ نابێ). بەڵام گوێت لەو بەشە نییە و ئەتەوێ دوای بکەویت. بەڵام دوای چی؟ کێ ئەستێرەیەکی کشاوی پێئەگیرێت؟ ئاه... بۆیە ئەگەر ڕۆژێك دیار نەمام، ئەوا ڕەنگە بە دوای سۆزانییەکی کشاودا بگەڕێم...

خەیاڵم چووبووە سەرکچەکانی و ئەبوو ڕەعد لێی پرسیم: لە کەس ناپرسی؟ باشترت دۆزیوەتەوە؟

منیش وتم: نا ئەبوو ڕەعد. ئەبێ کێم دەست بکەوێ؟ تەنیا ماندووم لەم کارە.

- یەکێك نەزانێ ئێمە دڵمان خۆشە بەوەی ئەیکەین... عەموو منیش تاقەتم چووە لە دارخورما و قەحبە و کۆتر و کتێبەکانیش... باش بوو هاتی، دەمێکە ئەمویست پێت بڵێم کە برۆ و کتێبەکانیش بەرە بۆ خۆت... هەمووی... لەوانەش بێزار بووم.

منیش پرسیم هەموو کتێبەکان؟

- ئا هەمووی

- ئەی ئاردەکە؟

- ئەویش لە کتێبەکاندایە... ئەویش ببە بەڵام پارەکەیم پێشەکی بەرێ، هەرچەند بە هەرزانتر لە هەموو جارێك ئەتدەمێ و گرنگیشە پارەکەت پێبێت... پێویستم بە پارەیە... هەموو شتێك ئەفرۆشم و ئەڕۆم... بە پێکەنینەوە وتی کچ و ژنەکەم لێناکرێت؟

- بۆ کوێ ئەبوو ڕەعد؟ کوێت هەیە؟

- گرنگ نییە بۆ کوێ... هەر قەحبەخانەیەك بێت... بۆ شوێنێکی تر خەڵك تۆزێ نەرمتر قسە بکات... کورە ئەوەش قسەی قۆڕە، تەنیا تاقەتی ئێرەم نییە. ئەم باخ و بێستانە بووە بە ئاودەستێکی گەورە لەبەرچاوم... هەموو شتێ ڕوونە...

ئەبوو ڕەعد کەسێکی سەیرە... قەت ناوی منی نەهێناوە. جاروبار بە عەرەبیە عامییەکەی بە (عەمموو) بانگم ئەکات... قەتیش سەیری نەکردووم. هەندێ جار گومانم هەیە من ببینێت ئەمناسێتەوە. پەیوەندیی من و ئەبوو ڕەعد بەو جۆرە مەزانن، کە بۆم باس کردن... بەو جۆرە نییە... ئەبوو ڕەعد بێدەنگترین کەسە ناسیبێتم... بە ئاستەم کە پێویست بکا، قسە ئەکات... لە ژیانیدا نەمبینیووە پێبکەنێت... خۆی زووزوو ئەڵێت من یەك جۆرم، نە دڵخۆش نە دڵتەنگ... ئەو گەنجێکی سەرەڕۆی ماسیگر ئەبێت لە تەنکاوەکانی باشووردا، دواتر خزمەتی سەربازی ئەبینێت، دوای ئەوەش هەرچۆنێك بووە، ئەبێت بە ئەفسەرێکی پایەداری دەوڵەت. نە لەبەر ویژدان و نە باوەڕی سیاسی، ئەبوو ڕەعد دواتر ئەبێت بە دژی دەوڵەت و خۆی ئەشارێتەوە و تەمەنێکی زۆر لە جەردەیی و دزیدا ئەژی هەتا لەو وڵاتە شۆڕش ئەکرێ و پاشا ئەکوژن... لە دوای کوژرانی پاشاوە ئەبوو ڕەعد وا ئەژی، کە خەونی پێوە بینیبوو، بەڵام چی بوو کە وا بێدەنگ بوو؟ کەس لێی تێنەئەگەیشت. ئەبوو ڕەعد خولیای کۆکردنەوەی دەستنووس و کتێبە کۆنەکانی هەبوو... گەورەترین کتێبخانەی هەبوو، کە تەنیا من و چەند کەسێکی نزیکی خۆی پێمان ئەزانی... وەنەبێ خوێنەرێکی باش بووبێت هەرچەند عاشقی شیعر و خوێندنەوەی ژیانی پاشا کۆنەکان بوو. تەنیا عەرەبیشی ئەزانی، بەڵام بە هەزاران دەستنووسی شاکارە جیهانییەکانی هەبوو... دەستنووسی (هاملێت، فاوست، شەڕ و ئاشتی...) من بە چاوی خۆم بینیوومە لە کتێبخانەکەیدا، کە دەستنووسی ئەسڵیی نووسەرەکان بوون... سەدان دەستنووسی شاکاری تر کە خۆی پیشانی دام و ئەیوت عەمموو ئەمانە ملیۆنان پارەی پێدراوە و خوێنی لەسەر ڕژاوە تا گەیشتوون بە من...



پەیوەندیم بە ئەبوو ڕەعدەوە نە زۆر دەمێکە نە تازە... کەسمان باوەڕمان بەیەك نییە... ئەویش کەم پرسیار ئەکات و غرورێکی ماندووکەری هەیە، کە بە فیزەوە قسە لەگەڵ چواردەوری خۆی ئەکات. زۆربەی جار کە پرسیاری لێئەکرێت، تەنیا سەر ڕائەوەشێنێت نەك لەگەڵ ئێمە کە سادەین، خۆم بینیوومە لەگەڵ وەزیرە گەورەکان بە بێئەدەبی و غرورێکی بێئەدەبانەوە تەلەفۆنی کردووە... ڕەنگە هی ئەوەش بێت، کە قەت خۆی پێ غەڵەت نییە... کەسێکە ئەبوو لە ئەنجامی خەڵەتاندن و فێڵەکانی بیکوژم، بەڵام ئەبوو ڕەعد کەسێکی سەیرە، جارجارە پیاو بیری ئەکات...

هەندێ ساڵ هەیە دەیان جار دێم بۆ لای. بەڵام وا تەمووزە و یەکەمجارمە دێم بۆ لای...



ئەمجارە هاتم بەشە ئاردەکەی خۆم بەرم (ئێوەش نەبن بە دایکم، کە هەر بە ڕاستی وایزانی کە من بازرگانی ئاردم و بە گاڵتە ڕۆژێك بە دایکم وت ئا هەر بەو ئاردە نانێنکمان بۆ دروست بکە تا لە خۆشیدا بفڕین).

ئەمساڵ کە هاتم بۆ لای ئەبوو ڕەعد، یەکەم جارمە بە جۆرێکی تر ئەبینم کە هەر سەرەتا بۆ ئێوەم باس کرد، کە بە گوێی لەشفرۆشێکا بچرپێنێت و پێبکەنێت. لە هەمووی سەیرتر بەخشینی کتێبەکان بوو بە من و باسکردنی ئەوەی کە سەفەر ئەکات و لێرە نامێنێت... ئەبوو ڕەعد رایچڵەکاندم و وتی: ئەوە بۆ وا ڕاچڵەکایت؟

وتم هیچ... هیچ... دوای دێمەوە سەر درێژەی قسەکانمان لەگەڵ ئەبوو ڕەعد. ئێستا قەڵەمەکە ئەدەم بە یەکێکی تر کە هەمیشە گلەییم لێئەکات کە من درۆ ئەکەم و منیش وەك ئەبوو ڕەعد خۆمم پێ ڕاستە... لە سەرەتای ئەم گێڕانەوەیە ئەویش ئاگادار بوو و وتی ئەمجارە ئەو گێڕانەوەیە بەبێ من ناگێڕریتەوە. (شاباز) دەمێکە برادەرمە، بەڵام هی ئەوە نییە لە ڕۆژی قورسا پشتی پێببەستی. کەمێك کەرۆکەیە، هەرچەند جارجار لە ڕۆژنامەدا چیرۆك بڵاو ئەکاتەوە و خەڵك بە قەڵەمبەدەستێکی خراپ ناوی نابەن... وەلحاڵ، با ئەویش شتێك بڵێ. دوای دێمەوە سەر قسەکانی خۆم و ئەبوو ڕەعد...

****

درۆ ئەکات. ئەو چیی وت، ئێوە تۆزێك خۆتان ماتڵ بکەن و بیر لە پێچەوانەکەی بکەنەوە. من لەگەڵی بووم کە چووین بۆ لای ئەبوو ڕەعد. بڕوام وایە ئەسڵەن ئاماژەی بە منیش نەکردبێ... دە وازی لێبێنن... ئەو هەروایە... پێکەوە بووین کە چووین. ئەو هەر وا حەزی لێیە لە خۆیەوە قسەی قۆڕ بکات... خۆی بێدەنگە و زوو زوو ڕائەمێنێت، بەڵام بە سروشت حەزی لە هاوار و هەڵایە. شەرمنە و قەت ناتوانێ سەیری ناوچاوی بەرامبەر بکات. بەڵام حەزی بەوە نییە. خۆی هەموو جارێك ئەڵێت شاباز چی بکەم؟ ئەم سروشتە یەك پارچە لە گووەم ناگۆڕێت... چی ئەڵێت من گوێی لێناگرم، بەڵام سوێندی داوم بە گیانی دایکم کە تەنانەت ناویشی لێرە نەهێنم. سوێندەکەم ناشکێنم، بەڵام ناکرێت بە (ئەم و ئەو) بانگی بکەم، ناوێکی خوازراوی بۆ ئەهێنم، تا ئاسانتر بزانین باسی کێ ئەکەین. هەرچەند بۆ گاڵتەوگەپیش جارجارە خۆی بەو ناوەوە بانگ ئەکەین... ناوی ئەنێین ئیڤان، خراپ نییە. ناوێکی باشە... دەمێکە ئیڤان

ئەناسم، لە ڕێگای گروپێکەوە کە ناوی (چیرۆکنووسانی وڵاتی بێسێبەر) بوو. پێشنیازی ناوەکە هی خۆی بوو. سەرەتا کە ئەو ناوەی پێشنیاز کرد، هەموومان پێکەنیین، بەڵام پاساوەکەشی جوان بوو کە وتی خۆتان بێعەقل مەکەن، سەیری چیرۆکەکانتان بکەن ئەڵێی لە تەنووردا نووسراون، زەرڕەیەك فێنکییان تیادا نییە. ئەوکات ڕازی بووین کە ئەو ناوە خراپ نییە... دوای ئەوەش ئەو کاتەی ئێمە ئەو ناوەمان هەڵبژارد، سەدان گروپ هەبوو لە ناوی ڕۆمان و شیعری شاعیرە فارسەکانەوە خوازرابوو. ئێستاش کە باسی ئەکەین، پێکەنینهێنەرە بۆ هەمووومان. بۆ نموونە (گروپی پاییز) یان (کۆمەڵەی ئەو چیرۆکنووسانەی کە مۆسیقارن) (شیکەرەوە گەلاّییەکان) (ڕەخنەگری ئەدەبیات جگە لە مەحوی) (دانیشتوانی دانیشتنە ئەدەبییەکانی گوێگری مۆسیقا هیندییەکان) ئیستاش پێیان پێئەکەنیین... با دوور نەکەومەوە کە چی ئەڵێم... ئیڤانم لەوێ ناسی... عاقڵ نەبوو، بەڵام وەك ئێمەش کەر نەبوو. وەك ئێمە حوکمی نەئەدا و وەك ئێمە خیرا عاشق نەئەبوو... وەك ئێمە لایەنگیری ئەم و ئەو نەئەبوو، بەڵام ئەوەی دواجار ئیڤانی کردبوو بە قەشمەرێکی ڕەها، ئەو تێکەڵبوونەی بوو لەگەڵ پاڵەوانی کتێبەکان. ئەو عەرەبییەکی زۆر باش و ئینگلیزییەکی باشی ئەزانی و ئەبوو ڕەعد و چەند کەسێکی تر کتێبی جۆراوجۆریان پێئەدا... وەك وتم، ئەوەی ئیڤانی قەشمەر کرد، ئەو تێکەڵبوونەی بوو... ڕۆژ هەبوو هاواری ئەکرد و شێتانە گاڵتەی ئەکرد، کە دوایی بۆمان دەرئەکەوت لەبەر ئەوە بووە ئەو ماوەیە سەرقاڵی (یەسەنین) بووە. هەندێ ڕۆژیش هێمن و بەختەوەر و ژیاندۆست خۆی ئەنواند. کە لێمان ئەکۆڵییەوە، ئەمانبینی ئەو ماوەیە خەریکی خویندنەوەی (پامۆکە)... ڕۆژ هەبوو یان هەفتە و مانگ هەبوو لە عەلاگەیەکی ڕەشدا بیرەی دەرئەهێنا و جنێوی ناشیرینی تەنانەت بە کچەکانیش ئەدا. لێمان ئەپرسی ئیڤان ها ئەمجار کێ لەگەڵ خۆی بردوویتی؟ ئەویش لێی نەئەشاردینەوە و بیرەی بەرز ئەکردەوە و ئەیوت گەوجانە (بۆکۆڤسکی)!! بوکۆفسکی سەگبابێکی خۆشەویستە!!

ئیڤانی ڕاستیمان کەم جار ئەناسی، ئەویش کاتێك بوو ئەگەر کتێبێکی سیاسیمان بە دەستییەوە ببینیایە... جارجاریش بە گفتی خۆی ئەیوت ئەبوو ڕەعد جارجارە **100** غرامێك ئاردی سپیم ئەداتێ و ئەوەش وای ئەکرد شتێك لەو سروشتەی ببینین، کە شتێك لە خۆی تیابوو... زووزووش باسی ئەبوو ڕەعدی ئەکرد. هەڵبەت کەسمان ئەبوو ڕەعدمان نەبینیبوو، بەڵام ئیڤان ماوەماوە کە دیار نەئەما، ئەیوت لای ئەو بووم... تەنانەت وای لێهات





سەفەرەکانی بۆ لای ئەبوو ڕەعد زیادی کرد و ئەیوت شاباز بە کەسیان مەڵێ. ئێستا جگە لە کتێب، لەگەڵ خۆمدا ئاردێکی سپیی مەستکەر ئەهێنم و ئەتوانین پێکەوە کڕیاری تایبەتی خۆی بدۆزینەوە و پارە پەیدا بکەین و دەوڵەمەند ببین... سەرەتا لەگەڵی نەبووم، دواتر ڕازی بووم. بەڵام هەر ئەیوت جارێ پەلە مەکە. شەراکەتی ئەم جۆرە ئیشانە متمانە و چاوەڕوانیی ئەوێت... هەرچەند هەمیشە غافڵ نەبووم لەوەی کە ئیڤان بارگاوییە بە درۆ. من پێی ئەڵێم درۆ، هەندێ لە هاوڕێیان پێی ئەڵێن (خەیاڵ). هەرچییەك بێ، لە کۆتاییدا درۆیە، چونکە ڕاستی نییە، خەیاڵی نەفرەتی کە کتێبەکان بۆیان دروست ئەکرد. ئەکرا لە هەر قسەیەکی ئیڤاندا کە ئەوپەڕی سادەش بێت، خەیاڵ یان درۆیەك بدۆزرێتەوە... ئەو کوڕەی کە بووبوو بە برادەرمان و ناوی ئیڤان بوو، کە سی ساڵ و چەند مانگێك بوو، خۆی نەبوو هێندەی کۆکراوەی چەندەها بیرۆکە و فەنتازیای ناو کتێب و فیلمەکان بوو بە غرورێکی خەستیشتەوە...

ئاگاداری کردمەوە کە سبەی ئەچین بۆ لای ئەبوو ڕەعد... سبەی بۆ نیوەڕۆ هات بە شوێنما و بە درێژایی ڕێگاکە و کە لە گەراجەکەش چاوەڕێی پڕبوونی پاسەکە بووین، ئیڤان کەوتە ناو بێدەنگییەکەی خۆیەوە. وتی شاباز، بەم زەردی و هێڵنجهێنان و گەرمایە هەست ئەکەم بەشێکم لە (پیدرۆ پارامۆ). بە جنێوێك دەمیم داخست، چونکە هەر ئەو کاتە زانیم وا بۆ ئێوەی باس ئەکات، کە لە ناو پاسەکە چ دۆزەخێك بووە. ڕاستە گەرم بوو، بەڵام هیچ ڕووی نەدا... هەموو شتێك باش بوو... وەلحاڵ، چووینە ماڵی ئەبوو ڕەعد و ژنێکی بەتەمەن دەرگای لێکردینەوە... بە ڕاڕەوێکی درێژدا چووینە ماڵێکی مامناوەندەوە و لە ناوەڕاستیدا حەوشەیەك هەبوو. لەوێوە کچێکی بچووك پێی وتین وەرن بۆ باخەکە. باوکم لەوێ چاوەڕێیە. چووینە باخەوەکەوە. چەند دانە دارخورمایەك و لە نێوانیاندا حەسیرێك داخرابوو. کابرایەکی مامناوەندیی کەمێك لاوازی چرچەوەبوو بەخێرهاتنی کردین، کە ئەبوو ڕەعد خۆی بوو و کچێکی چوار پێنج ساڵانەی لە باوەشدا بوو، کە دوای تۆزێك دانیشتنمان بە کچەکەی وت بچۆ دەستی مامەکان ماچ بکە. من ماچێکی سەریم کرد و چووە باوەشی ئیڤانەوە و دانیشت. ئیڤانیش وەك ئیشوکار و کەسابەتی خۆی کەوتەوە ناو خەیاڵە قووڵەکانی... ئەبوو ڕەعدم لە نزیکەوە بینی و زانیم ئەو دەعبا قووڵە نییە، کە ئیڤان ساڵانێکە بە سەرکێشی و بەسەرهاتەکانی مێشکی بردبووین... کابرایەکی بێدەنگی ماندوو... ناسیاوییەکی دووریان لەگەڵ ئیڤاندا هەبووە و دوای

تازەبوونەوەی ناسیاوییەکەیان لە ڕێگای خزمێکی ئیڤانەوە ئەبوو ڕەعد بە ئیڤان ئەڵێت ئەگەر کتێبت ویست، وەرە بۆ لام... کتێبخانەیەکی خنجیلانەی هەبوو، بەڵام نەك بەو جۆرەی کە ئیڤان باسی ئەکرد... کابرایەك بوو وەك ئیڤان ژیانی لە خەیاڵا بردبووە سەر... ئا... ڕێك ئیڤان بوو... ئەویش زووزوو خەیاڵ دوور ئەیبرد... ئەسڵەن هیچ ئاردێکیش لە گۆڕێدا نەبوو. وەك ئەوەی درۆیەك بێت و خۆی و ئیڤان لەسەری ڕێك کەوتبێتن...

بە ئیڤانی وت کتێبەکانم بۆ داناویت و بیبە بۆ خۆت. ئەمجارە ئێمە سەفەرە ئەکەین و ڕەنگە نەمبینیت... ئێرە چیتر ئارام نییە و ئیش نەماوە و زووزووش مناڵ ئەفڕێنن... ئیڤان پێت ناڵێم بۆ کوێ ئەچین، نەوەك سەرکێشی بکەیت و خۆت بگەیەنیتە ئێمە... جارجار نامەت بۆ ئەنێرم... ئیڤان لە کاتی ئەو قسانەدا وەڵامێکی ئەدایەوە و ئەچووەوە ناو خەیاڵەکانی خۆی... پەست بووم لێی... زۆر پەست کە ئەو دوو وەهمەم لە تەنیشت یەکەوە بینی... کە ئەو دووانەیەم بینی، کە یەك کەسن و یەکێکیان زەمەن زۆرتر کشانویەتی و یەکێکیان تازە بەو ڕێگایەدا ئەڕواتەوە، کە ئەوی تری پیا ڕۆشتووە و ئەم خەڵەفاوەی ئێستای لێدەرچووە. پەست بووم، وتم ئیڤان ئەم بێدەنگییە کۆتایی پێبێنە... کوڕی کەر... بەسە، خەیاڵات دروست مەکە... ئەمە ئەبوو ڕەعدە سۆپەرمانەکە بوو؟

ئا با یەك شتی ترتان پێبڵێم پێش ئەوەی ئیڤان خۆی بۆتان باس بکات. چونکە ئەزانم ڕەنگە هێندە سامناك باسی ئەو عادەتەی من بکات، کە لای ئێوە بمکات بە بێئەخلاقترین کەس... شتەکە وا نییە. تەنیا کە زۆر تووڕە ئەبم لە ئیڤان، بیری ئەخەمەوە کە تۆ پاڵەوان نیت و تەنیا وەهمە حیزەکانی خۆتە ئەم کەلاوەیەی کردووە بە کەشوهەوای ناو ڕۆمانەکان... ئەوەش خاڵی لاوازی ئیڤانە، کە یەکێك واقیعی بیر بخاتەوە... زۆر تووڕە ئەبێت، هەڵبەت منیش ئەو چەکە بەس ئەو کاتانە بەکار ئەهێنم، کە زۆری لێ پەست ئەبم... کە ئەزانم سادەترین شت ئەو کوڕە ئەباتە خەیاڵێکی قووڵەوە... پێم وت قسە بکا، چونکە من لەم بێدەنگییەدا لە نێوان ئێوەیا نائارامم... تۆش و ئەبوو ڕەعدیش بێدەنگن و ئەوە بۆ من بێزارکەرە... ئیڤان بە ئاگا هاتەوە و سوور بووەوە، هەستی کرد کە هەستم کردووە ئیڤان کێیە؟ ئەتوت تا ئەو ساتە بێئاگا بووە لەوەی کە من نازانم ئەو کوڕە کێیە؟ پێشتر ڕەنگە بێئاگا بووبێت، بەڵام بە جۆرێك سەیری کردم، کە ئیتر تێگەیشت منیش و هەمووشمان دەمێکە زانیوومانە ئیڤان کێیە... ڕەنگە ڕۆشتنی ئەبوو ڕەعد و نەبینینەوەشی تووڕەی کردبێت سەرباری ئەوەی کە منیش قسەی خۆمم پێوت...





منیش زیاتر تاسە گرتمی کە تووڕەتری بکەم... زانیم کە دەماری گرتی، هەستم ئەکرد کە کاتیەتی بەر تیری بدەم... ئیڤان کەم بە قسەی ئێمە تووڕە ئەبوو، ئەسڵەن حسابیشی بۆ نەئەکردین. کات بوو کە داخی ئەوانەی پێبڕێژم... ئەوەش زۆر پەستتری کردم کە ئەبوو ڕەعدم بینی چ بوودەڵەیەکی داماوە و ئیڤان چەند ساڵە چۆن باسی ئەکات... زانیم تووڕە بوو، پێکەنیم... هەستم بەوە کرد کە پێکەنینەکەم بۆ ئەو زۆر تووڕەکەرە... ئەمزانی هەر وشەیەك بڵێم، ئەو ڕابردووی خۆی بیر ئەکەوێتەوە کە لە چ وەهمێکدا بووە... هەر وشەیەك کە وتم، لاوازییەکانی خۆی بیر ئەکەوتەوە... وتم بەسە بەئاگا بەرەوە... بڕوا بکەن ئەمویست دەستی بگرم و بێتەوە ناو واقیع... جارێکی تر بە سوکایەتییەوە وتم ئەمە بوو ئەبوو ڕەعدە عەفریتەکە؟ هاهاها... ئاگری گرت... ئاخر نەئەبوو... ئەبوو ڕەعد کەوتە قسە، زانیم کابرایەکە وەك ئیڤان داماو... تەمەنێکی بە فەنتازیا بردۆتە سەر، نەگبەتی لە ئیڤان داماوتر... نیو سەدەی بە خوێندنەوە بردبووە سەر لە ناو ئەو جەنگە زۆرانەیا، کە بە درێژایی تەمەنی ئەو وڵات تێی کەوتبوو. ئەبوو ڕەعد تەنیا بە کتێب قەڵایەکی فەنتازیی بۆ خۆی دروست کردبوو... ئیڤانیش باوەڕی بەوە هێنابوو... بۆ ئیڤان و ئەبوو ڕەعد ئاسانتر بوو باوەڕ بە وەهمەکانی یەکتر بێنن وەك لە ڕاستی... ئەبوو ڕەعدی داماویش هەر برا و کەسوکاری کوژراوە و لە سێدارە دراوە، ئەمیش هەر هیچی پێنەکراوە جگە لەوەی بەسەرهاتی ژەنەڕاڵ و زاڵمەکان بکات بە هی خۆی... ڕۆژێك خۆی بکات بە ماسیگرێکی لێهاتوو، ڕۆژێك دزێکی نێودەوڵەتی، ڕۆژێك جەنەڕاڵێکی کودەتاچی. هەندێك جاریش خۆی بکات بە کۆکەرەوەی دەستنووسی شاکارە جیهانییەکان... ئەوەی ئیڤانی تووڕە کرد لە قسەکانی مندا، ئەوە بوو زانیی من درکم بە هەموو ئەو شتانە کرد... زانیی کە هەستم بە شکانی غروری کرد... زانیی من ئیڤان ئەبینم وەك گەنجیی ئەبوو ڕەعد و داهاتووی ئیڤانیشم لە بەردەمە، کە داماوێکی وەك ئەبوو ڕەعدە... لە کەسی قبوڵ نەئەکرد تەنانەت لە خۆشی، کە غروری لە بەردەمیا بشکێنێت...

تەواو، من لەوە زیاتر ناڵێم، وا بزانم ئیتر خۆتان شتێك حاڵی بوون. تکایە ئێوەش باوەڕی پێمەکەن. چونکە تا ئێوە باوەڕی پێبکەن ئەو خراپتر ئەبن... ئیڤانم خۆش ئەوێ و کوڕێکە ناوی ئەنێم مناڵێك بە سروشتێکی مناڵانە و سادەییەکانیەوە...

****

کەسیان باوەڕم پێناکەن و ئەبێ منیش تەنیا بۆ ئەوە بژیم، کە چاوەڕێی ئەوە بم ئەوان باوەڕم پێبکەن... شاباز با بنووسێت و چی وتووە، وەك خۆیی لێی وەرگرن تەنیا ئەوەتان لێئەخوازم کە چی ئەڵێم، لێم تێبگەن و هەموو قسەکانی ئەو مەکەن بە ڕاستییەکی تەواو... لەگەڵ ئەبوو ڕەعد لە قسەدا بووین و بێدەنگ بووین... ماوەیەك تێڕامابن و شاباز بە گوێمدا چرپاندی و بیرم نییە چی وت، بەڵام لە خۆمەوە هەستم کرد تەنیام... هەستم کرد هەوا گەرم و شێدارە و ئەمەوێت بڕشێمەوە بە خۆما... ئەبوو ڕەعد... شاباز... نەئەبووایە شاباز وا تێبگات من لە ئەبوو ڕەعد ئەچم... من ئەو نیم... ئەو ساتە پێویستم بە دڵنەوایی بوو... پێوستم بە دانپیانان بوو، کە من بچووك نیم... ئەمویست ئەو غرورەم کە وردەوردە بەرز ئەبووەوە، نەکەوێتە خوارەوە... ئەمویست بە پاڵتۆیەکی ڕەشەوە بچم بۆ شارێکی مۆدێرن و قومار بکەم و خەڵك بزانن من بەهێزم. هەموو خەڵك تێبگەیشتایە بە هەموو بونێکمەوە... بە باشی و خراپەوە من هەم و ڕاستیم... ئەو ساتە حەزم لە پاڵەوانبوون بوو، بەڵام شاباز پێچەوانەی هەموو ئەوانەی نیشان دام، کە ئەبوو ڕەعدی بوودەڵە بوو... ئەبوو ڕەعد ڕای چڵەکاندم وتی بۆ ڕاچڵەکای؟ وتم :هیچ...هیچ...

من پێم وت: ئەبوو ڕەعد؟

(سەیری کردم)

ئەبوو ڕەعد تۆ هیچ نیت... هیچ هیچ نیت. تۆ پیاوێکی وەك تەپەدۆر... وەك هەوا... وەك کانزای زۆر و زەبەندی هەرزان.

ئەبوو ڕەعد وتی: ئەبوو زۆر پێش ئیستا وام پێبڵێیت.

- ئەبوو ڕەعد تۆ ئینسان نیت... بشکوژرێیت لۆمەی بکوژ ناکرێ... بە من ناکوژرێی، تۆ بە کەس ناکوژرێی ئەی ئەبوو ڕەعد... باشتر کە ئەڕۆیت و ناتبینمەوە... ماڵئاواییش ناکەین... با یەکسەر نەتبینمەوە.

- عەموو لە کۆتاییدا درکت کرد ساڵانێکی زۆرە ئەو ئازارەم هەیە، کە تۆ هەتە... ئیڤان ئێمە ڕاستی نین؟؟ ئێستا بینیت ئێمە هیچ قەڵایەکمان نەبووە! چەند زوو ڕووخاین! چەند سادە کاول بوویت و بووم!

پێم وت: ئەبوو ڕەعد پێویستم بە نەوتە... ژێر قادرمەکان لێیەتی؟

****

خۆمم شاباز... ئەبوو ئیڤان خۆی ئەم باسە دابخات و کۆتایی پێبێنێت، بەڵام پێئەچێت





نەتوانێت... ڕەنگە تا ماوەیەکی زۆریش نەتوانێت... وابزانم هەموو ئەزانن کە چی ڕووی دا؟
ئیڤان ئەو شەوە چیی بە ئەبوو ڕەعد وت، هەستی کرد ڕۆژێك دێت یەکێك وای پێئەڵێتەوە و زۆر ترسا... هەر کە من تۆزێك لۆمەم کرد و تووڕە بووم، زانیم لە ناخەوە ئەکولا... ئەبوو ڕەعد هەر هێندەی وتی چی بوو بۆ وا ڕاچڵەکایت؟ ئیڤان هەستی کرد ئەگەر حساباتی خۆی یەکلایی نەکاتەوە، ئیتر مێژووی ئەبوو ڕەعد ئەکات بە هی خۆی... ئەبوو پتەوییەك بدات بە جدیاتی یەکلاییکردنەوەی ئەو مێژووەی کە تێی کەوتووە، ئەبوو ئەو کارە بکات... ئەبوو بقیژێنێ و هاوار بکات بەسەر ئەبوو ڕەعدا... هاوارێك لە کوشتن ترسناکتر... هاواری ئەکرد و ئەیوت ئەبوو ڕەعد تۆ هیچ نیت... تۆ ئەبێ بکوژرێی، بەڵام حەیف کە تۆ هی کوشتن نیت و ناکوژرێیت... ئیڤان باش ئەیزانی ئەم قسانە بە خۆی ئەڵێ... هەستا و پرسیاری نەوتی کرد، پێئەچوو ئەبوو ڕەعدیش ساڵانیکی زۆر بێت چاوەڕێی ئەو ساتە بکات لە ئیڤان... ئەویش بێزار ببوو لەو شارستانیەتەی لە شارێکی تاڵ و بێسێبەری باشووردا بۆ خۆی دروست کردووە... ئەویش نەفرەتی ئەکرد، بەڵام هێزی نەبوو دەری ببڕێت... ئیڤان چووە ژێر قادرمەکان... ئەبوو ڕەعد هاواری کرد ئیڤان هیچ نەبێ کتێبەکانی سەر مێزەکە بەرە... وەك بڵێی هەردووکیان ساڵانێکە خەریکی داڕشتنی ئەو سیناریۆیە بن... ئیڤان وتی نا، با هیچیان ڕزگاریان نەبێ. ئیڤان بەرەو ژوورەوە ڕۆشت. من تاسابووم، من سەیری ئەبوو ڕەعدم ئەکرد. ئەبوو ڕەعدیش بە شەرمێکەوە سەیری دارخورماکانی ئەکرد. بۆنی دووکەڵێك لەکتێبخانەکەوە هات و ئیڤان هاتە دەرەوە و پێی وتم با بڕۆین... ئەبوو ڕەعد لە جێی خۆی نەئەجوولا... وەك بڵێی خۆشی تێگەیشتبێ کە بوونی نییە... ئیڤان سەیری هیچی نەکرد و چووە دەرەوە تەنیا من سەیری ئەبوو ڕەعدم کرد و وتم خوات لەگەڵ. وەڵامی نەبوو، منیش ڕام کردە دەرەوە...
لە ماڵەکان دورکەوتینەوە... سووتانی کتێبخانەکە و ماڵەکەی ئەبوو ڕەعد لە ناو باخە خورماکاندا ئەو ناوەی تەواو ڕووناك کردبۆوە... دیمەنێکی جوان بوو، بەڵام خەمهێنەریش بوو...



# یاریی بلیارد

## ئەلفۆنس دۆدێ

### و. لە ئینگلیزییەوە: ژوان شوانی

لەبەر ئەوەی دوو ڕۆژە لە شەڕدان و شەویان بە کۆڵەپشتەکانیانەوە بەژێر باراندا بەڕێ کردووە، سەربازەکان تەواو شەکەتن. بەڵام وا سێ سەعاتە، چەك لەسەر زەوی، لەو چەقی ڕێیەدا و لە قوڕولیتاوی کێڵگە خوساوەکاندا، چاوەڕێ دەکەن.

کاس و شەکەت بە بێخەویی و بە جلکی بە باران تەڕ، سەربازەکان دەترنجێنە ناو یەکتر تا گەرم دابێن. هەندێکیان هەر بە پێوە سەر لەسەر کۆڵەپشتی سەربازەکەی تەنیشتییان دادەنێن و وەنەوز دەیانباتەوە. هاسان ماندوویی و برسێتی بە ڕووخساری ئەوانەی خەو زۆری بۆ هێناون، دەناسرێتەوە. باران، قوڕ، بێ ئاگر و خواردن، ئاسمانێکی نزم و تاریك و لە سەروو هەمووشییەوە دوژمن لەو نزیکانەوەیە.

لەوێدا چی دەکەن؟ چی قەوماوە؟ تفەنگەکان، بە لوولەی ڕووەو زەوییەوە، دەڵێی لە ئەرزەکە دەنۆڕن. تۆپچییەکان لە

کەمیندا چاویان لە ئاسۆ بڕیووە.  پێدەچێ هەموو شت ئامادە بێ بۆ هێرشبردن. ئەدی بۆچی هێرش نابەن؟ چاوەڕێی چ دەکەن؟
چاوەڕێی فەرمان دەکەن و بنکەی فەرماندەیی چ فەرمانێك نانێرێت. بنکەی فەرماندەییش دوور نییە. لە گردەکەی ئەوبەرە لە قەڵای لویز-تریز، کە خشتە سوورەکانی بە باران شۆردراون و لە نێو درەختەکانەوە بریسکەیان دێ. ئەوێ هەوارگەیەکی شاهانەیە و شایستەی مارشاڵی فەڕانسەیە. لەودیو خەندەقێکی بەرین و دیوارێکی بەردینەوە کە قەڵاکە لە جادەکە دادەبڕێت، چیمەنێکی سەوز و نەرم هەیە و ئینجانەی پڕ گوڵ تا بانیژەی قەڵاکە ڕیز کراون. لە پشتیشەوە، لە دیوە نهێنییەکەیەوە، لە بۆشایی نێوان پەرژینەکەوە، زەریاچەیەك دیارە کە وەك ئاوێنە ڕاکشاوە و قووەکان تێیدا مەلە دەکەن. لەژێر میچی شێوە پەرستگەی قەڵاکەدا، تاوس و قەرقاوڵی ئاڵتوونیی باڵ ڕادەوەشێنن و خۆیان دەنوێنن، لە نێو دارودەوەنەکەوە دەنگی تیژیان دەبیستری. گەرچی قەڵانشینەکان لەوێ نەماون، بەڵام هەست بە چۆڵەوانی و وێرانەیی شەڕ ناکرێت. مایەی سەرسوڕمانە کە هێند نزیك لە بەرەی جەنگەوە، بێدەنگییەکی قووڵ لە جوانیی و بێخەوشیی ئەم قەڵایەوە، لە ڕیزبەندیی ورد و ڕێکیی پەرژین و ڕێگەکانییەوە، هەڵدەقوڵێ.
ئەو بارانەی لەوبەرەوە جادەکان پڕ دەکات لە قوڕولیتە و گۆمی پیس و ناشرین، لێرە نەرمەبارانێکی شیك و ئەریستۆکراتییانەیە، ڕەونەق بە سووریی خشتەکان و سەوزیی چیمەنەکە دەدات، تیفتیفەی گەڵای دارپرتەقاڵ و پەڕی سپیی قووەکان دەدات. هەموو شت بریسکەی دێ، هەموو شت ئارامە. هەر بە ڕاست گەر ئەو ئاڵایەی لە سەربان دەشەکێتەوە و ئەو دوو سەربازە نۆبەتدارە نەبوونایە، کەس مەزەندەی نەدەکرد کە ئێرە فەرماندەیی سوپایە. ئەسپەکان لە تەویلەکانیاندا دەحەسێنەوە و جاروبار مەیتەرێك یان خزمەتکارێك دەبینرێت بە موبەقەکەدا دێت و دەچێت، یان باخەوانێك کە بە کاوەخۆ شەن بە چەوی ناو حەوشەکەدا دێنێت.
ژووری نانخواردن کە پەنجەرەکەی بەسەر بانیژەکەدا دەڕوانێت، مێزێکی لێیە کە ڕووپۆشێکی چرچولۆچی دراوە بە سەردا و چەند بوتڵێکی هەڵپچڕاو و پەرداخی خاڵی و بەکارهاتووی لەسەر جێماوە، وەك بڵێی پاشماوەی ئێوارەخوانێك بێ و ئێستاش میوانەکان ڕۆیشتبن. لە ژوورەکەی تەنیشتەوە، گوێت لە دەنگی بەرزی کەیف و سەفا و تەقەی تۆپ و زرینگەی پەرداخ دەبێت. مارشاڵ یاریی بلیارد دەکات؛

بۆیە سوپاکەی چاوەڕێی فەرمان دەکات. کە مارشاڵ دەستی بە یاری کرد، ئاسمانیش بڕوخێ لە یاریی خۆی ناکەوێت.
بلیارد! ئەمە خاڵی لاوازی ئەو شەڕڤانە مەزنەیە. ڕادەوەستێت، بە هەمان جدییاتی ڕاوەستانی شەڕەوە، بە تەواوی جلوبەرگی سەربازیی و سینگپۆشراو بە مەدالیای ئافەرین. چاوانی داگیرساوە و لە تاو مەینۆشی و جۆشوخرۆشی یارییەکە، ڕوخساری سوور هەڵگەڕاوە. دەستەودایرەکەی پەرۆش و بەوپەڕی ڕێزەوە دەوریان داوە؛ ستایش و سەرسووڕمانی خۆیان بەسەر کارامەیی لێدان و جوڵەی تۆپەکاندا دەبارێنن. کە مارشاڵ خاڵێك دەگرێ، هەمووان بە پەلە بۆی دەنووسن؛ کە مارشاڵ تینووی دەبێ، بە هەڵەداوان خواردنەوەی بۆ دێنن. لێکدا لێکدا خشوهوڕی ڕیشاڵی کەتافی و پەڕی جلك و زیرینگەی مەدالیا دێ. دیمەنی ئەو هەموو زەردەخەنە شیرینانە، ئەو هەموو حورمەتگرتنانە، ئەو هەموو جلکە نوێ و بە قەیتان نەخشێنراوانە لەم ژووره فراوان و بە داری ساج داپۆشراوانەدا، ڕۆژانی پاییزم بیر دێننەوە و بە بەراورد بە قاپوتی قوڕاویی و جەستەی هەڵلەرزیو و غەمباری بەر بارانەکەی ئەوبەر، فەرەحییەك بە دڵ دەبەخشن.
ئەوەی بەرامبەر مارشاڵ یاری دەکات، کاپتنێکی گەنجە، پشتێن لە پشت و کەمێك چەماوە و جووتێك دەستکێشی لە دەستە. ئەو لە یاریزانە هەرە باشەکانە و دەتوانێ یاری بلیارد لە هەرچی مارشاڵی سەر زەوی هەیە، بباتەوە؛ بەڵام بەشی ئەوە سەلیقەی هەیە، کە خۆی کەمێك لە خوار سەرکردەکەیەوە ڕابگرێ و وزەی خۆی بۆ نەبردنەوە، بەڵام هاوکات بۆ دۆڕانێکی زۆر سەخت تەرخان بکات. ئەو لەو ئەفسەرانەیە، کە وەك دەڵێن خاوەن داهاتوویەکی پرشنگدارە.
ئاگادار بە، ئەی ئەفسەری لاو! مارشاڵ پازدە خاڵ و تۆ دە خاڵت هەیە. ئامانج ئەوەیە یارییەکە بەم شێوەیە بهێڵیتەوە تا کۆتایی؛ ئاوها چانست باشترە بۆ بەرزکردنەوەی پلەوپایەت وەك لەوەی لە دەرەوە لەگەڵ ئەوانی تردا لەبەر لێزمەی باران و تۆفاندا ڕاوەستابیت و لە چاوەڕوانیی فەرمانێکدا کە نایەت، خوڕ خوڕ ئاو بە جەستەتدا بێتە خوارەوە و قەیتانی ئاڵتوونیی سەر شانەکانت ڕەش داگەڕێنێ. بە ڕاستی یارییەکی سەرنجڕاکێشە. تۆپەکان خل دەبنەوە و بەیەکدا دەدەن و ڕەنگەکانیان تێکەڵاو دەبن. لێواری نەرمی مێزەکە دەیاننێرێتەوە بۆ ناوەڕاست. لەناکاو، چەخماخەی گوللـەتۆپێك بە ئاسماندا دەکشێت، گرمەیەکی کپ شووشەی پەنجەرەکان دەخاتە لەرە. هەمووان ڕادەچڵەکن و بە نیگەرانییەوە لە یەکدی دەنۆڕن. بە





تەنها مارشاڵ مێش میوانی نییە؛ بەسەر مێزەکەدا دەچەمێتەوە و بۆ تیلێکی بێوێنە سەرقاڵی پلاندانان دەبێ.
بەڵام ئەوەتا چەخماخەیەکی تر، ئەوەش دانەیەکی تر. گوللــەتۆپەکان یەك لە دوای یەك دێن.
دەستەودایرەکەی ڕادەکەنە بەر پەنجەرەکە. بڵێی پروسیاییەکان هێرش بکەن.
مارشاڵ گەچ لە سەری داری بلیاردەکەی دەخشێنێ و دەڵێت: "زۆر باشە، با هێرش بکەن!"
- "نۆرەی تۆیە کاپتن!"
جەماعەت لە سەرسامیدا هەڵدەلەرزن. توغێن*ـی خەولێکەوتوو بەسەر گالیسکەی تۆپەکەیەوە،
لە چاو ئەم مارشاڵەدا کە وا بێخەم، چەند ساتێك پێش چوونە جەنگ یاریی بلیارد دەکات، هەر
هیچ جێگەی بەراورد نییە. هاوکات، دەنگەکان دووهێندە دەبن. شیڕەی گوللــەتۆپەکان تێکەڵ
بە شەقژنی دۆشکە و تەقوتۆقی تفەنگەکان دەبن. دووکەڵێکی سوور و ڕەش لە چیمەنەکەوە
هەڵدەستێ. تەواوی باخەکە گڕ دەگرێ. تاوس و قەرقاوڵە تۆقیووەکان لە قەفەزەکانیانەوە
دەقریشکێنن؛ ئەسپە عەرەبییەکان لە تەویلەکانیانەوە بۆنی باروت دەکەن و دەکەونە
سمکۆڵان. دەستەی فەرماندەیی دەپەشۆکێت. تەتەرەکان خێرا خێرا پەیام لە دوای پەیام دێنن.
داوای بینینی مارشاڵ دەکەن.
- ناتوانرێ مارشاڵ ببینرێت. ئەی پێم نەوتیت ئاسمانیش بڕوخێ، ئەو لە یاریی خۆی ناکەوێت.
- نۆرەی تۆیە کاپتن.
بەڵام کاپتن شڵەژاوە. چونکە گەنجێتی یانی شڵەژان. تەماشا، خەریکە سەری لێدەشێوێ و
تاکتیکەکەی خۆی بیر دەچێتەوە؛ یەك لە دوای یەك خاڵ دەگرێ و خەریکە یارییەکە دەباتەوە.
بۆیە مارشاڵ تووڕە دەبێت. ڕوخساری پیاوانەی بە بێزاری و سەرسامیی تەنراوە. هەر لەو ساتەدا،
ئەسپێك بە حیلەوە دەگاتە حەوشە. یاوەرەکەی، کە سەرتاپای گیانی لە قووڕدا پۆشراوە، پاڵ بە
دەرگەوانەکانەوە دەنێ و بە قەڵەمبازێك خۆی دەهاوێژێتە ئەودیوەوە و هاوار دەکات: "مارشاڵ، مارشاڵ!"
خۆزگە دەتبینی مارشاڵ چۆن پێشوازیی لێدەکات. لە تووڕەییدا وەك کەڵەشێر گیف و سوور بۆتەوە، لە
پەنجەرەکەوە لە کاتێکدا کە داری بلیاردەکەی بە دەستەوەیە، هاوار دەکات: "چی بووە؟ ئەم فەرتەنەیە
چییە؟ دەرگەوان لەوێ نەماوە؟"
- "بەڵام ئاغ مارشاڵ..."

- "باشە، یەك دەقیقە؛ چاوەڕێی فەرمانم بکەن، ئەی هاوار!"

وا دەڵێ و زرم پەنجەرەکە دادەخات.

چاوەڕێی فەرمانی ئەو بن! ئاخر ئەوان لە کەنگێوە چاوەڕێن! با باران و ساچمە دەدات بە دەموچاویاندا. هەندێ بەتالیۆن بە تەواوی لەناو چوون و هەندێکی تریان بێکەڵك و ڕەپ وەستاون و تێناگەن لەوەی کە ئاخۆ بۆ ناجووڵێن. هیچ ناکرێ. چاوەڕوانی فەرمانن. بەڵام پێویست بە فەرمان ناکات بۆ مردن؛ وردەوردە بە سەدانیان لێدەمرن و لە بەردەم قەڵا خامۆشەکەدا دەکەونە ناو گژوگیا و خەندەقەکانەوە. تەنانەت دوای کەوتنیشیان ساچمە گیانیان دەئاژنێ و لە برینەکانیانەوە خوێنی فەڕانسە بە بێدەنگی دەڕژێ. لە سەرەوە، ژووری بلیاردەکە ئێجگار گەرم داهاتووە؛ مارشاڵ خاڵی باشی گرتووە، بەڵام کاپتنی بچکۆلە وەك شێر بەرگری دەکات.

- حەڤدە، هەژدە، نۆزدە!

بە ئاستەم کاتیان بۆ تۆمارکردنی خاڵەکان هەیە. نەعرەتەی جەنگ نزیکتر دەبێتەوە. مارشاڵ تەنیا یەك تیلی دیکەی ماوە. خومپارە دەکەوێتە باخەکەوە. دانەیەك لە ئەستێڵەکەدا دەتەقێتەوە. ئاوێنەکە هاڕە دەکاتە خوارەوە؛ قوویەك زراوی چووە و بە پەڕوباڵی خوێناوییەوە، شێتانە لە ئەستێڵەکەدا مەلە دەکات. ئەمە دوایین تیلە.

پاشان، بێدەنگییەکی ڕەها. تەنیا دەنگی باران لەسەر گەڵای درەختەکان و چەند گرمەگرمێکی تێکەڵپێکەڵ لە خوار گردەکەوە و دەنگێك وەك دەنگی هەنگاوی خێرای کۆمەڵێکی ڕاکردوو دێتە گوێ. سوپا لە کشانەوەدایە. مارشاڵ یارییەکە دەباتەوە.

*

سەرچاوە: کتێبی (باشترین کورتەچیرۆکەکانی زەمەن، بەشی دووەم)



- ئەلفۆنس دۆدێ لە ساڵی ١٨٤٠ لە شاری (نیم)ی فەڕانسە لەدایك بووە. دوای ئەوەی ماڵی باوکی تەواوی سەروەت و سامانیان لە دەست دەدەن، ئەلفۆنس چیدی ناتوانێت درێژە بە خوێندن بدات و ناچار لە ماڵی بەگێکی دەوڵەمەندا کار دەکات. دواتر دەچێتە بەرەکانی سوپاوە، بەڵام لە ترسی کۆمۆنەی پاریس ئەویش جێ دێڵێت. دۆدێ یەکەم ڕۆمانی لە تەمەنی چواردە ساڵیدا و یەکەم کتێبی شیعریی لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا لە

چاپ دەدرێت. ئەو بە نووسینە تەنزئامێزەکانی کە زیاتر وێنای ژیان و کەسێتیی کاراکتەرەکانی باشووری فەڕەنسە دەکەن، ناسراوە. لە شازدەی دیسەمبەری ١٨٩٧دا کۆچی دوایی دەکات.

* ئانغی دی توغێن شەڕڤانێکی ئازای سوپای فەڕانسە بووە لە سەدەی حەڤدەهەمدا. بەڵام بە هۆی ئەوەی لە منداڵیدا لە ناو خێزانێکی دەوڵەمەنددا بە نازداری گۆش کراوە، باوکی هەمیشە گوتوویەتی کە هەرگیز مەزەندەی ئەوە ناکات توغێنی کوڕی بەرگەی ژیانی سەختی سەربازیی و جەنگ بگرێت. توغێن بۆ تەحەداکردنی ئەم قسەیەی باوکی، شەوێکی زستان تا بەیانی بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە دەمێنێتەوە. پاش گەڕانێکی زۆر بە دوای توغێندا، فەرماندەکەی بە نوستوویی بەسەر گالیسکەی تۆپەکەیەوە دەیدۆزێتەوە. دوای ئەم ڕووداوەش توغێن وەك یەکێك لە قارەمانەکانی بەرەی شەڕ ناوبانگ دەردەکات. جێی باسە توغێن یەکێکە لەو شەش مارشاڵەی کە لە مێژووی فەڕەنسەدا پلەی (گەورە مارشاڵی فەڕانسە)یان پێدراوە.

سەرچاوە:

**The best Short stories of All Time**

**Volum II**

**Edited by: J. D. Labranche**

# لە دێرسیم مردم، لە بانە شێتبووم



**مەحمود نەجمەدین**

تاریك و ڕوونی بەیانی، تەقەی قاپی لە خەوێکی قووڵ و شیرینی کردم، بە ڕوخساری خەواڵووەوە لۆژەلۆژ بەرەو دەرگاکە چووم و گوتم "کێیە؟" بە دەنگێکی قەبەوە گوتی "دەرگاکەم لێبکەوە خۆ ناتخۆم، میوانم میوان".

قاپییەکەم کردەوە، پیاوێکی ڕەقەڵ و باڵابەرزی دەموچاو کونج کونجاوی بوو، بە پێچە و کڵاو و مرادخانیی بەرییەوە لە خەڵکی ناوچەی موکریان دەچوو. هێشتا من فەرمووم لێنەکردبوو خۆی کرد بە ژووردا، ئیتر منیش بەدوویدا چووم.

ڕێبوارێکی هیلاك و شەکەت بوو، لەسەر قەرەوێڵەکەم دانیشت و گوتی "برسیمە، هیچ هەیە بیخۆم؟"

- بەچاوان، ئێستا خواردنت بۆ ئامادە دەکەم.



- تۆ جارێ بچۆ دەموچاوت بشۆ، بەم لوتە زلەوە دەڵێی بەرازی سەرخۆشی.
- ببوورە، ئەمشەو درەنگ خەوتووم، بۆیە خەبەرم نەبۆوە.
وەك دوو دۆستی بیست ساڵە بەیەكەوە نانی بەیانیمان خوارد و ئەوجا كەوتینە گفتولفت. وەختێ لە ئاغای میوانم پرسی چ كارەی؟
دەستی كرد بە گیرفانی شەرواڵەكەیدا و سیدییەكی دەرهێنا و گوتی "لە نێو و نێونیشانی من گەڕێ، ها ئەم سیدییە بگرە".
- ئەمە چییە؟
- ئەوە بۆ تۆیە، دوایی گوێی لێبگرە، دەزانی چییە. تۆ جارێ برۆ چۆڕێ ئاوم بۆ بێنە.
سیدییەكەم لێوەرگرت و چووم بۆ چێشتخانە تا پەرداخێك ئاوی بۆ بێنم، لێ تا من گەڕامەوە، ئاغای نەناس بۆی دەرچووبوو. ئیتر نەمزانی چۆن ونبوو، بە كوێدا ڕۆیشت. تا سەری كۆڵان چووم نەمبینییەوە، نازانم زەوی قووتی دا، فڕی...! نازانم بۆ كوێ چوو. دەرگایماڵم داخست. بە خەیاڵی سیدییەكەوە چوومە ژوورەوە و لاپتۆپەكەم داگیرساند تا بزانم نهێنیی ئەم سیدییە چییە. شیعرە، گۆرانییە، شانامەیە...
ئەوەی لە سیدییەكەدا تۆمار كرابوو، ئەمەیە كە من بۆ ئێوەی دەگێڕمەوە:
بە دەنگی خشەخش و كرانەوە و داخرانی دەرگا و كۆكەكۆك خولەكێك و پانزە چركەی سیدییەكە ڕۆیشت. لە پاشان دەنگێكی لێهات، هەستم كرد دەنگەكە نزیكە لە دەنگی ئاغای میوانەوە، لێ دڵنیا نەبووم دەنگی هەمان ئەو پیاوەیە كە سیدییەكەی بۆ هێنام، ئاخر خۆ من ئەوەندەم قسە لەگەڵ نەكرد تا بتوانم بە باشی دەنگی بناسمەوە...
گێڕەرەوەی حیكایەتی نێو سیدییەكە ئاوها دەستی پێكرد:
من حەسەنی خوسرەویم، شەوێكی ساردی زستانی ساڵی **1346**ی هەتاوی لە گوندێكی دوورەشاری ناوچەی موكریان لەدایك بووم، ڕوخساری دایكمم بە باشی نایەتە بەرچاوان. تەمەنم چوار ساڵی تەواو نەدەبوو، شەوێكی درەنگ دایكم تووشی نەخۆشییەكی نەزانراو بوو. لە گوندێكی دوورەدەستدا هەر كەس دەردێك بگرێ، مەگەر خودا حەكیمی بێت. هەر ئەو شەوە دایكم بە ژانێكی قورسەوە مرد. بۆ منی منداڵیش جگە لە گریانێك شتێكی تر نەبوو، باوكیشم وەك زۆربەی پیاوانی دی هەر زوو دایكمی لە بیر كرد و چاوی بۆ ژن دەگێڕا، ساڵێك بەسەر مەرگی دایكمدا تێنەپەڕیبوو، باوكم ژنی

هێنایەوە، ئیتر ژیانی من لێرە بە دوا هەر بەلەنگازی و ئاوارەیی بوو، باوکم لە دوای ئەوەی ژنی هێنایەوە، لەسەر ویست و ئارەزووی ژنی تازە منی دەرپەڕاند و ماڵەمام منیان گرتە خۆ.
بە نازی مام و مامۆژنی وەجاخکوێر ساڵانێکم بە تێروتەسەلی  لەو ماڵەدا گوزەراند، تا ئەو کاتەی بووم بە گەنجێکی تەواو. ئیتر خولیای گەشت و گەڕان لە سەری دام، ڕۆژێك دوای مشتومڕێکی زۆر ڕەزامەندیم لە مامم وەرگرت و ڕۆیشتم. لەم شار بۆ ئەو شار و لەم گوند بۆ ئەو گوند دەگەڕام، لە کوێ ئاهەنگ بووایە، من گۆرانیم تێدا دەچڕی. لە ژیانمدا هیچ کارێکم نەدەزانی جگە لە گۆرانیگوتن، خوا هەموو شتێکی لێسەندمەوە و دەنگخۆشیی پێبەخشیم.

بە گۆرانی ژیام...

بۆ عەشق مردم

سەروەت و سامانم بە لاوە گرنگ نەبوو، لە هەر کوێ ئارەزووم بکردایە، گۆرانیم دەچڕی، بە نان و ماستاوێك ڕازی بووم. تا جلکم نەدڕایە، هی تازەم نەدەکڕی. ئەوەی دەستم دەکەوت، دەمخوارد. کەم شەو هەبوو دەعوەت نەکرێم، هەر جارە بۆ ماڵێك بانگێشتی سترانچڕین دەکرام، جارێك لە ماڵەئاغای، جارێك لە ماڵەکوێخای و جارێك لە شار لە ماڵی ئەفەندییان و جارجارێك لە ئاهەنگی ژن و ژنخوازیی... ئیدی ئاوهام ڕابوارد تا شەوێك خزامە تاریکیی عەشقێکەوە.

شەوێکی فێنکی بەهار لە ماڵی عەلی بەگی بانە بانگهێشتی سترانچڕین بووم. ئەو شەوە لە حەساری عەلی بەگ دەنگم لێ هەڵبڕیبوو، کەیفم هەبوو، عەلی بەگ زووزوو مژی لە قلیانەکە دەدا و دەیگوت ڕەحمەت لە بابت. عەلی بەگ شاهەنشایەك بوو بۆ خۆی، ڕەوەیەك خزمەتکار و غولام و ڕیزێك ژنی جوان و جاحێڵی هەبوو. مەڕ و ماڵات و مڵکی زۆریشی هەبوو. وەهای دەگوزەراند، شای بە سەپان ڕانەدەگرت. ئیدی ئەو شەوە لە حەوش و باخی فێنێکی ماڵی عەلی بەگەوە دەنگم لێ هەڵبڕی سترانم چڕی و کەیفم کرد، لەو وەختەیا چاوم چووە سەر گوێسەبانەی ماڵی بەگ، کێژێکی جوانم بینی لە مانگی دەڕوانی، ئیتر خۆشم نەمزانی ڕێڕەوی گۆرانیم بەرەو کوێ چوو، ئاگام لە مەجلیسی عەلی بەگ نەما. ئەو کچە ڕێحانە خانم بوو، کچە بچووکی عەلی بەگ بوو لە ژنی سێیەمی.





لەو شەوەڕا عەشقی من بۆ ڕێحانە دەستی پێکرد، ئیتر ماڵی عەلی بەگم  کردبوو بە ڕێی کانی، زووزوو خۆم پێدا دەکرد. چەند جارێك داوام لە عەلی بەگ کرد کارێکم پێبسپێرێ. هەر دەیگوت باشە... تا لە دواییدا لە حەساری عەلی بەگ وەك خزمەتکار و سترانبێژ نیشتەجێ بووم. عەلی بەگ ئەمری کرد ژوورێکم بۆ تەرخان بکەن لە خانووی خزمەتکارەکان لە تەنیشت کۆشك و باڵەخانەی خۆی. ئەو ژوورەی درا بە من، پەنجەرەکەی لەسەر حەوشە و حەساری عەلی بەگ بوو. بۆ بینینی ڕێحانە چاوم لەسەر پەنجەرە بوو. ڕێحانەش بێئاگا لە من جرتوفرت ڕۆژی بیست کەڕەت بە لای پەنجەرەی ژورەکەدا دەهات و دەچوو. ئەم عەشقە هەر وا لە دڵی خۆمدا قەتیس مابوو، نە دەموێرا دڵم بۆ ڕێحانە بکەمەوە و نە دەموێرا لای خزمەتکار و غولامەکانی دی باسی بکەم. ئاخر عەلی بەگ بیزانیبایە، شەقشەقێنی ئەو ماڵەی پێدەکردم. لەو ڕۆژەوە ڕێحانەم دیبوو، هەرچی گۆرانیم هەبوو، بۆ ئەو بوو. هەرگیزیش نەموێرا بۆ تەنیا جارێك ئەو ڕازە بدرکێنم مەگەر شەو درەنگانێ لەژێر لێوەوە بە ئاوازێکی هێمن و نەرم دەمگوت "عەشقی ڕێحانە کردمی بە دێوانە... دێوانەی چاوی، شێت و شەیدای لەنجەولاری، دێوانە دێوانەیە حەسەن، دێوانەی لێوانی، مەست و سەرخۆشی مەمانی..."

بە عەشقی ڕێحانەوە ژیام، بە خەیاڵی باوەشییەوە ڕۆژگارم دەگوزەراند. شەوانە بە خەیاڵی ڕێحانەوە دەخەوتم و خەونم بە ڕێحانەوە دەبینی. سترانچڕینم هەر بۆ وی بوو، گریان و خەمخواردنم هەر بۆ وی... هەستم دەکرد ناگەم بە موراد، ڕۆحم پێی دەگوتم تۆ سەرگەردان دەبی، بە عەزابی ئەو عەشقەوە شێت دەبی. شەوێکی ساردی پاییز پەژارە دایگرتم، غەم گەرووی گرتم، خەریك بوو دەخنکام... لە حەژمەتا چوومە سەربان تا هەوایەکی فێنك هەڵمژم، بە خەیاڵی ڕێحانەوە چاوم بڕییە مانگ و بە دەنگێکی نزم گۆرانیم دەچڕی. هەر بەو خەیاڵەوە خەوم لێکەوت و بەرەبەیان لە سەرما وەخەبەر هاتم، بە لەرزەلەرز چوومە خوارەوە و خۆم تەپاندە ژێر لێفەوە و خەوتمەوە و بەیانی وەختێ وەخەبەر هاتم، هەستم کرد نەخۆشم، جەستەم گەرم بوو، قورگ و کەپۆم گیرابوون. هەرچەندم دەکرد، نەمدەتوانی هەستم. بەجارێ تێك شکابووم، وەك شۆڕەبی دەلەرزیم، وردەوردە حاڵم خراپتر دەبوو، بە خۆم نەدەزانی دەنگی ناڵەناڵم گەیشتە گوێی غولام و خزمەتکارەکان. ئیتر هاتن بە دەنگمەوە، وەختێ عەلی بەگ پێی زانی، یەکێ لە پیاوەکانی ڕاسپارد تا بمبات بۆ خەستەخانە... ئەو نەخۆشییە پاییزییە سەرمایەکی وەهای خستە جەستەمەوە، هەرچیم دەکرد لێم نەدەبوویەوە، یەك تۆز سەرمام بوایە، حاڵم لێدەهاتەوە، بە یەك کزەی سارد هەفتەیەك لە جێدا دەکەوتم، وەك بڵێی نەخۆشییەکە لە

گیانمدا خۆی شاردبێتەوە. خەریك بوو پاییز بارگەی دەپێچایەوە، بارێزەی زستان گەڵاکانی پاییزی ڕامالّی و بەفربارین دەستی پێکرد. ئێوارەیەك لە پەنجەرەکەوە دەمڕوانییە حەوشە، وردەوردە بەفر سپیی دەکرد، دەمێك بوو میزم دەهات، لە ترسی سەرما نەمدەوێرا بچم بۆ سەرئاو، ئێ سەرئاوەکەش لە حەوشە بوو، ئیتر میز زۆری بۆ هێنام و ناچار بووم برۆم، ئەوەندە بەپەلە ڕۆیشتم، لە حەوشەکەدا خلیسکام، بە جۆرێك کەوتم، هەرچیم دەکرد، نەمدەتوانی هەستمەوە، خەریك بوو بێهۆش دەبووم، نەمدەتوانی دەنگ هەڵبڕم، نازانم عەلی بەگ لە کوێوە منی بینیبوو، گوێم لێبوو هاواری کرد کوڕەکان فریای حەسەن کەون...

خلیسکام...

کەوتم...

وەختێك بە خۆم زانی لە دێرسیمم

پیاوانی عەلی بەگ دەمودەست گەیشتنە سەرم و بە باوەش بردیانمە سەر جێگاکەم، دایانپۆشیم و کوورەیان بۆ داگیرساندم، وردەوردە گەرم بوومەوە، حاڵم باشتر بوو. عەلی بەگ هاتە سەر سەرم، ویستم هەستم، دەستی خستە سەر سنگم و گوتی هەڵمەسە، چیتە ڕۆڵە بۆ ئاوها خلیسکای، نابێ ئاگات لە خۆت بێت؟ ئادەی کوڕەکان بچن شۆربای بۆ بهێنن. حەسەن من دەڕۆم، تا تەواو باش نەبووی، لەژێر لێفە نەیەیتە دەرێ.

بۆ نانی ئێوارە مریشك و برنج و شۆربایان بۆ هێنام، ناوسکم بە تەواوی گەرم بووەوە و لەژێر لێفەی قورس و ئەستووردا خەوم لێکەوت، شەو درەنگ لە دەنگی جیڕەی دەرگا بێدار بوومەوە، پیرێژنێك بەسەر سەرمەوە وەستا بوو، خۆشم نەمزانی کێیە و لە کوێوە هاتووە، پیرێژنێکی پشت چەماوەی سپیکەلانە، برۆکانی پڕ و سپی بوون، چاوەکانی قووڵ بوون. خاڵێکی ڕەش لەسەر ڕوومەتی لای چەپی بوو، بەسەر سەرمەوە وەستابوو. دەستەکانی خستبووە سەر شانم و ئەم حیکایەتەی بۆ گێڕامەوە:

خوسرەوی ئازیز، ئای تۆ چەند بەدبەختی، عاشقێکی دڵشکاو و نامورادی. تۆ لە ژیانەکەی پێشووتریشدا ناموراد بووی. تۆ لە ئەزەلەوە دڵت بۆ شکست کراوە، ئیدی ئاغا بیت یان مسکێن، هیچ لە حاڵی تۆ ناگۆڕێ، دڵی تۆ دڵی دێوانەی عەشقە، سەد جار بمری و زیندووبییەوە، لە دەستی ئەو دڵە نامورادە دەرباز نابی. تۆ لە ژیانەکەی پێشووتردا ئاغا بووی، ئاغایەکی دڵشکاو، ڕۆحێکی پەرەوازە بووی خەڵکی خۆزگەیان







بە حاڵت دەخواست، لێ تۆ خۆزگەت بە حاڵی هەموو کەسێ دەخواست جگە لە خۆت. ئاغای مەملەکەتێك بووی، کە دەیانگوت سەلجان ئاغا، شاخ دەلەرزی، ئاو دەوەستا، بەرد دەهاتە قسە. ئەرێ، تۆ سەلجان ئاغای کوڕی زەینەڵ ئاغا بووی. وەختێ لەدایك بووی ئاغا بووی. ئاهەنگ و بەزم و باڵۆرەی لەدایکبوونت لە دێرسیمدا دەنگی دایەوە، لە چارسەنجەق و قۆزیجان و ئەرزنجانەوە پیاوی گەورە گەورە داوەت کرابوون. دەتگوت ئاهەنگی سوڵتانە. هەر لە منداڵییەوە بە سەلجان ئاغا بانگ دەکرای. پیاوەکانی باوکت فێری ئەسپسواری و تیرهاوێژی و ویقاری ئاغایەتییان کردی. وەختێ زەینەڵ ئاغای بابت مرد، تۆ گەنجێکی تەواو بووی، بە بالآ و بە هەیکەل و بە ویقار ئاغایەتی هەر لە خۆت دەهات. هەر ئەو وەختە لەگەڵ ناو و ناوبانگی تۆدا، ناوبانگی ناریکە خانیش دەنگی دایەوە، نەك لە ئاموتقە و ڕوسنەکا و چامورك، بگرە لە سەرانسەری دێرسیمدا باسی جوانی و سەنگینیی ناریکە خان دەکرا. بەڵێ ئەم حەسەنە بەدبەخت و بێچارەیەی ئێستا، لە ژیانی پێشووتدا سەلجان ئاغای دێرسیم بووی، عاشقە ئازیزەکەی ناریکە خان.
بڕیار وابوو لەگەڵ ڕیشسپیی مەملەکەتدا بچنە خوازبێنیی ناریکە خان، لێ دەرکەوتنی جەندرمە لە دێرسیم بارودۆخەکەی گۆڕی، ئیتر هەوری ڕەش ئاسمانی دێرسیمی داپۆشی، جەندرمەکانی دەوڵەت بە ڕم و نیزەوە کەوتنە وێزەی خەڵك، لافاوی خوێن هەستا، شەڕی جەندرمەکانی دەوڵەت و شۆڕشگێڕان و ئاغاکان گوند بە گوند و کۆڵان بە کۆڵانی شاری گرتەوە. دوای لە سێدارەدانی سەید ڕەزا و هاوڕێکانی، جەندرمەکانی دەوڵەت کەوتنە وێزەی خەڵکی. کەللەسەری پیاوانی بێگوناە بە دەستی جەندرمەوە بوو. دارستانی چاخلی لە خوێندا سوور بووبوو. ئەشکەوتەکانی کوتوزیکداغ سیخناخ بوون لە لاشەی مرۆڤ. خوێن گەیشتە لوتکەی توجك.
وەختێ جەندرمەکانی دەوڵەت دایان بەسەر کۆشك و دیوەخانی تۆدا. خۆت و پیاوەکانت ئازایانە هاتنە دەست و بەرگریتان کرد. ئیتر تۆش وەك هەندێك لە ئاغاکانی دیکە دات بە شاخا و یاخی بووی. لەم شاخ بۆ ئەو شاخ یاخیبوونت بەرپا کرد، لە چیای ژێلەوە بۆ سانیگا و... ئیزرایلی جەندرمە بووی. جارێ لە قزڵ کیلسە دەردەکەوتی و جارێك لە ئاموتقەوە هەڵتدەکوتایە سەریان. کاتێکیش کە بیستت جەندرمەکان پەلاماری ماڵی ناریکە خانیان داوە و ئەفسەرێکی پلەبەرز جلکی بەری ناریکە خانی دادڕیووە و کردوویەتی بە ژن و پاشان کوشتویەتی. ئیدی شێت و هار بووی، هەموو جەستەت ڕەق بوو، بووی بە بەرد، چاوەکانت سوور بوون...

تا ئەو کاتەی ئەفسەرەکەت نەکوشت، کۆڵت نەدا. بەوەش دڵت ئاوی نەخواردەوە. لە هەر کوێیەك جەندرمەیەکت دەبینی، هەر بە چەقۆ لەتوپەتت دەکرد. ئیتر سەلجان ئاغا بوو بە ئیزرائیلی جەندرمە، لە هەر کوێ باسی سەلجان ئاغا دەکرا، جەندرمە ڕادەچڵەکی، بە سەدان جەندرمە هێرشیان دەکردە سەرت کۆڵت پێدەدان، هەرچییان دەکرد، چاریان نەدەکردی. چەندین جەندرمە و ئەفسەری پلەدارت کوشت و دڵت ئاوی نەخواردەوە. تەنانەت ئالْپ دۆغانیش لێت دەترسا. شەوان بە ترس و دڵەڕاوکێوە خەوی لێدەکەوت. کە دەنوستیش، خەونی بە تۆوە دەبینی و ڕادەچڵەکی. دۆڵی زخوریت پڕ کردبوو لە کەللەسەری جەندرمە هێشتا تینوێتیت نەشکا. ناریکە خان برینێك نەبوو هەروا بە ئاسانی سارێژ بێ. باسوخواسی خەڵك هەر ئازایەتیی تۆ بوو.  وردەوردە شەڕ و کوشتار بەرەو کۆتایی دەچوو، یاخیبوونیش بەرەو دامرکانەوە، لێ تۆ کۆڵت نەدا، بووی بە ئاغای کێو و ئەشکەوتان. بە ژانی عەشقی ناریکە خانەوە لەم شاخ بۆ ئەو شاخ دەگەڕایت، لە ئەشکەوتەکان دەخەوتی، پیاوەکانت هەموو بێزار بوون، یەکەیەکە بەجێیان دەهێشتی و دەگەڕانەوە سەر ژیانی ئاسایی. دواجار هەر خۆت مایتەوە، ساڵانێك تێپەڕی بە ژانی ئەو عەشقەوە دەژیای، بارودۆخەکە بە تەواوی هێور بووەوە، سەلجان ئاغا لە بیر و خەیاڵاتی جەندرمەدا نەمابوو. دێرسیم ژیانی ئاسایی خۆی دەست پێکردەوە. تۆش چەك و چەقۆت فڕێ دا و بۆ عەشقی ناریکە خان بە کێواندا دەگەڕایت و گۆرانیت دەگوت، ئیتر لە خۆت نەدەپرسی من بۆ وا لە خۆم دەکەم، بۆچی دەژیم. ڕیشت شۆڕ بووەوە بۆ سەر ورگت، جلکی بەرت شڕ و شاتاڵ بوو، چڵکن و پۆخڵ، بە جۆرێك بووی، کەس نەیدەناسیتەوە، ڕۆژێك بە دوودڵییەوە لە کێوان هاتیتە خوارەوە و ڕووت لە ئاوەدانی نا، کەس نەیدەناسیت، سێ شەو و سێ ڕۆژ بە نێو شاردا گەڕای، هاوارت کرد... کەس نەیناسیتەوە، خەڵکی بە پێکەنینەوە دەیانگوت ئەمە تازەبابەتە. ئەم شێتە تا ئێستا کەس نەیدیووە، ئەمە لە کوێوە پەیدا بوو، یەکێکیش بەزەیی پێتدا دەهاتەوە نانێکی گەرمی پێدەدای و دەیگوت کورە ئەوەندە نەهامەتیمان بینی، هەموومان خەریکە وەك ئەم بەدبەختەمان لێدێت، تۆش دەتگوت بابە من عاشقم، عاشقی ناریکە خانم... هەموو قاقا پێدەکەنین... کەس نەیدەناسیتەوە، ئاخر سەلجان ئاغایەك بەو هەموو ویقار و هەیبەتەوە لە کوێ و شێتێکی چڵکنی ڕیشهاتوو لە کوێ. هەر زوو ناویان نای بزنەکەی ناریکە خان، ساڵانێکی زۆر بەو دەردەوە ژیای، ڕۆژگارت لە نێو بازاڕ و لە پاڵ دیواری ماڵان و لە مزگەوتەکاندا بەسەر دەبرد و شەوگاریشت لە قەیسەرییەکاندا بەڕێ دەکرد. هەندێك جار کەسێك بەزەیی





پێتدا دەهاتەوە و دەیبردییەوە بۆ ماڵ، شەوێك یان دوو شەو داڵدەی دەدای... ئاوها ژیای تا شەوێکی ساردی زستان لە حەژمەتی ئەو عەشقە ناکامەت جارێکی تر دات بە کێودا و هەر ڕۆیشتی و هەر ڕۆیشتی... تا لە پەلوپۆکەوتی و لە نێو بەفردا ڕەق بوویتەوە... ئەو سەلجان ئاغایەی دەوڵەت لێی دەترسا، وەك شێتێکی بێچارە و برسی و چڵکن لە نێو بەفردا ڕەقبوویەوە. وەختێکیش هاوین بەفری زستانی تواندەوە، تەنها کۆمەڵێك ئێسك و پروسکت مایەوە... مردنەکەت نەبووە جێی باسوخواسی خەڵکی، مەگەر جارجارە ئەو گەنجانەی کە سەریان دەخستە سەرت، دەیانگوت ئای یادت بەخێر، ئەرێ کەس نەیزانی چیی لێ بەسەر هات... سەلجان ئاغا ئەو پیاوە بەویقارەی بە نامورادی سەری نایەوە، بە ژانی عەشقێکەوە ژیا و هەر بە ژانی ئەو عەشقەوە سەری نایەوە. ئێستاش، لەم ژیانەتا ئاکامی عەشقەکەت هەر وەهایە، بە نامورادی سەردەنێیتەوە...

دوای ئەم قسانە پیرێژن نیوچەوانی ماچ کردم و من ڕاچڵەکیم. وەختێك بە هۆش خۆم هاتمەوە و چاوەکانم هەڵهێنا، لێوی مریەم خان لەسەر نێوچەوانم بوو. مریەم خان دایکی پەروێزی قاسمی بوو، ئەو پیاوەی کەوتبووە دوای حیکایەتی من. پەروێز سەردەستەی پاسەوانەکانی عەلی بەگ بوو. پیاوێکی بەویقاربوو، گاڵتەوگەپی نەدەزانی، لێ بەبەزەیی بوو. عەلی بەگ زۆری خۆش دەویست. گەرچی بە شێوە ناشیرین بوو، ڕەقەڵێکی درێژی دەموچاو کونج کونجاوی بوو، هەمیشە پێچە و کڵاو و مرادخانیی موکریانیی دەپۆشی. مریەم خانی دایکیشی وابوو، زۆر سەنگین و بەویقار بوو، پیرێژنێکی زۆر بەڕەحم و دڵپاك بوو. ئەوەی بیناسیبایە، خۆشی دەویست. من هەرپێم دەگوت دایە مریەم، وەختێ چاوم هەڵهێنا، گوتم:

دایە مریەم من بە نامورادی سەر دەنێمەوە؟ ئەی شێت دەبم؟

کە لە ماڵی عەلی بەگ دەرپەڕیم...

نەمزانی کەوتمە کوێی دنیاوە

بە زمانە شیرینەکەی خۆی زووزوو دەیگوت: نانا حەسەن گیان، تۆ خۆشبەخت دەبی، خودا تۆی خۆش دەوێت، هیچ نییە، چاك دەبیتەوە، وەك جارانت لێدێتەوە. قسەکانی ئارامییان پێبەخشیم، دایکە مریەم فرسەتی هێنا و چووە دەرەوە، بانگی پەروێزی کرد و پێی گوت: کوڕم بە عەلی بەگ بڵێ ئەم کوڕە گوناهە، حاڵی باش نییە، با بیبەن بۆ لای دختۆر.

کە گوێم لە قسەکانی دایە مریەم بوو، ئیتر زانیم ئاقیبەتی من ئاقیبەتی سەلجان ئاغایە. بە ژانی ئەو عەشقەوە شێت دەبم و بە نامورادی سەر دەنێمەوە. دوای ئەوەی بردیانم بۆ لای دکتۆر،

تۆزێك حاڵم باش بوو، بەڵام هەر دەترسام، غەمبار بووم، چارەنووسی خۆم وەك سەلجان ئاغا دەهاتە پێش چاو. جاربەجارێ حاڵم لێدەهات، لێ زوو فریام دەکەوتن و هێوریان دەکردمەوە. بە عەشقی ڕێحانەوە ژیام و هەرگیز نەموێرا بیدرکێنم. تا شەوێکی هاوین ڕێحانە وەك عادەتی چەند ساڵەی لە گوێسەبانی ماڵ دانیشتبوو و سەیری مانگی دەکرد. عەلی بەگیش وەك چەند شەوە قلیانی دەکێشا و زەوقی هەبوو، دیمەنی ڕێحانە دڵخۆشی کردم، وردەوردە مەست دەبووم، لەپڕێکدا چریکاندم، کەوتمە گۆرانیگوتن. بە بیستنی دەنگی من هەموو سەراسیمە بوون، دوای ئەو ماوە زۆرە لە نەخۆشی و بێدەنگی و نائارامی، بە دڵێکی خۆشەوە سترانم دەچڕی... ئیتر وردەوردە هەموو لە دەورم کۆبوونەوە و عەلی بەگیش زووزوو دەیگوت ئەی ئافەریم حەسەن، بچریکێنە، بچریکێنە تا هەرچی دەرد هەیە دەرچێ لە گیانت. لەو وەختەدا من گۆرانیم دەگوت، دەنگی تەقە بیسترا، شەڕ و پێکدادان لە نێوان پاسدار و پێشمەرگە دەستی پێکرد، ڕێحانە ترسا، خێرا هەستا بێتە خوارێ، من دڵم لە مشتمدا بوو، دەمویست بڵێم خۆت هەڵدەخوارێ من بە باوەش دەتگرمەوە. لە کاتی هەستانیدا گوللەیەك پشتی سەری ڕێحانەی پێکا و لە سەربانەوە کەوتە خوارێ، کەوتە باوەشی منەوە، لێ بە مردوویی. ئیتر ماڵەکە شێوا، عەلی بەگ خێرا پەلاماری دا و هاواری دەکرد ڕێحانە ڕێحانە... دەمودەست ڕێحانەیان بۆ بیمارستان برد، منیش وەك شێت بە دواییاندا. بیمارستان چ سوودی هەیە، ڕێحانە هەر بە ئاسمانەوە ڕۆحی دەرچوو. ئیتر کەس ئاگای لە من نەما، شێت و هار بووم، لە ماڵی عەلی بەگ دەرپەڕیم. هەر ئەوەندەی دەرچووم، ئیتر خۆشم نەمزانی چیم لێ بەسەر هات، کەوتمە کوێی دنیاوە. چارەنووسە ئیدی، لە دێرسیم مردم و لە بانە شێتبووم. ڕیشێکی درێژ و چڵکن جلکەکانی بەرم شڕ و دڕاو بوون. گۆرانییەکانم گوزارشت بوون لە نامورادی و ئاوازەکانم تۆنێکی تاریك بوون لە شکست. لەم شار بۆ ئەو شار شێت و سەرگەردان و ناموراد گۆرانیم دەگوت و دەگریام و هاوارم دەکرد و دەمچریکاند: ڕێحان ڕێحانە، ڕێحانەی جوانم، عەشقی کوژراوم. ئەوەی کەوتە خوارێ، ڕۆحی تۆ بوو یا هی من؟



لویس کۆزەر ، ستیڤ سیدمەن

# سۆسیۆلۆژیای
# کارل مارکس



وەرگێڕانی
حەمە قادر



# ڕێکەوتی تۆڵە

ئاوات غولامی

دەمویست بە نیوەپێچێك بە لای دەستەڕاستدا، لە شەقامی ئیبراهیم پاشاوە سەرکەوم بۆ ئەو شەقامەی دەچێتەوە سەرمزگەوتی سەیوانی دوو، پاشان بە ئاڕاستەی شەقامی خوار گۆڕستانەکە، تا دڵنیا بم لەو بەرکەوتەی بەر ئاوێنەی لای ڕاستی ئوتومبێلەکەم کەوت و نەمبینی. بەڵام کارمەندی هاتوچۆکە بە دەستی ڕاستی ئاماژەی پێدام ڕاستەوڕاستی شەقامەکە بەردەوام بم. وا بیرم کردەوە، ئەو شەقامەی من دەمویست نیوەپێچێکی تێدا ئەنجام بدەم، ڕەنگە کاری هەڵکەندی تێدا ئەنجام درابێت، کاتێك لە ئاوێنەی ناوەوەی ئوتومبێلەکەم ڕوانی، کارمەندی هاتوچۆکە ئوتومبێلەکانی دوای منی بۆ ئەو شەقامە ئاڕاستە دەکرد. گەر خێرایی یەکێك لە ئوتومبێلەکانی لای دەستەچەپم

نەبووایە، دەرفەتی نیوەپێچەکەم دەبوو بە ئاڕاستەی شەقامی ئەوبەر بیمارستانەکەوە.
گەیشتمە بەردەم عەمودە پەیژەییەکەی ناوەندیی گۆیژەی کوڕان، خێراییەکەم هێنایە خوارێ. بە ئاگاییەوە، دەمویست پاشەوپاش بگەڕێمەوە. چەند جارێك هەوڵم دا، بەڵام گێڕی ئوتومبێلەکەم خیرەیەکی لێوە هات و بە یەکجاری مۆڵەتی گەڕانەوە دواوەم لە دەست دا.
ئەو خێراتر لە من دەرگاکەی کردەوە. دوو کتێب و نامەیەکی لەسەر داشبولەکە دانابوو، وتی تا (مەکتەبی وەتەن) بمبە بە بیست دیناری جاران. هیچ دەرفەتی وەڵام دانەوەی نەدامێ کە جارێکی تریش (مەکتەبی وەتەن)ی لە قسەکانیدا جێ کردەوە، خۆ دەزانی مەکتەبی وەتەن لە کوێیە. ویستم پێی بڵێم، ببوورن، دەتوانن تەکسیی تر ڕاگرن، بەڵام ڕوخساری بە شێوەیەك سەرنجی ڕاکێشام، کە ڕازی بووم سەریبخەم. لە ماوەی گەیشتمان بەو فلکەیەیەی کە جاران پەیکەری کاوەی ئاسنگەرییان لێ دانابوو، پرسیی ئەمڕۆ چەندی مانگە؟
هەڵە نەبم بیستی مانگە، بیستی دوانزەیە، ڕۆژێکی سارد و تەماوییە. (دنیا لە سینەی مندا ماتەمە و لە چاوی تۆشدا تەمە) ئەمە ئەو وتی. خێراییەکەم هێنایە خوارێ و بە ئاگاییەوە لێم پرسی، خەمبار دیارن، لەوە دەچێ بەسەرهاتێك یان قسەیەکتان لە دڵدا بێت و بە دوای دەرفەتێکدا بگەڕێن بۆ گێڕانەوەی. مۆڵەتی قسەکردم لە ماوەی چاوەڕوانیی هەڵبوونی گڵۆپی ترافیکەکە کۆتایی هات.
کاتێك کارمەندی هاتوچۆکە، بە دەستی ڕاستی، ئوتومبێلەکانی پێشەوەی بە ئاڕاستەی ئەوبەری شەقامەکە ئاڕاستە کرد، بە دەستی چەپی تەنها ئاماژەی بە ئوتومبێلەکەی ئێمە دا، کە ڕاستەوڕاست بەو شەقامەدا کە درێژ دەبێتەوە بۆ بناری شار، بڕوات.
ئەو وتی، گەر بەو ئاڕاستەیەدا ڕێ نەکەین، ژمارەی ئەو شەقام و کۆڵانانەی دەمانگەیەننە مەکتەبی وەتەن، بیست شەقام ناکات. دواتریش گوتی، ئەمە یەکەم جارمە لەگەڵ شۆفێری تەکسییەکدا ڕێ بکەم هەم دەرفەتی گێڕانەوەم بدات و هەم لەو خەمە قووڵەی سینەشم تێبگات.
کە لە قسەکانی بۆوە، گەیشتینە چوارڕیانەکە. کارمەندی هاتوچۆکە مۆڵەتی لەناکاوی بەو ئەمبولانسە دا، کە لە دەستەڕاستی شەقامەکەوە بە ئاڕاستەی ئەوبەری شەقامەکە بە خێراییەکی زۆر ویقەویقی بوو.
لەو ماوە کورتەی چاوەڕوانیدا ورتەورتێکی لەبەر خۆیەوە کرد. منیش وا هاتە گوێم کە (بۆ دەبێت



کەسێکی وام ڕێکەوت کردبێت بۆ گێڕانەوە).
منیش خەیاڵێك گوزەری دەکرد بە مێشکمدا، بۆ پێش گێڕانەوەی بەسەرهاتێك دەکەوم، لەگەڵ کەسێکی نەناسراودا، کەسێك هەنگاوەکانی بە دوودڵی و ڕاڕاییەوە ڕێك دەخا.
یان ئەوە منم دزە دەکەمە ناو خەیاڵەوە و هێواش هێواش دەیهێنمە گۆ. یان ئەوەتا لە گەمەیەکەوە ئاڵاوم، کە ژیان خۆی هەنگاو بە هەنگاوی یاساکانی گێڕانەوەی ڕێك دەخا.
کاتێکیش دەزوولەی خەیاڵم بۆ لێدانی (بەرکەوتنەکەی) شەقامی گۆڕستانەکە دەچوو، خێرا ژێوان دەبوومەوە، کە هیچ ڕێکەوتنێك لە نێوانماندا نییە...
کاتێك کارمەندی هاتوچۆکە مۆڵەتی لێخوڕینی داین، لەگەڵ نزیکبوونەوەمان لە دواترافیکی ئەو ڕاستە شەقامە، تەمەکە تا دەهات چڕتر دەبۆوە.
من هەنگاوێك پێش ئەو کەوتم، وەك هەست بکەم هێشتا دوودڵە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی یان بە یەکجاری پەشیمان بووبێتەوە.
پێم وت گەر لێدەرکردن بۆ ژمارە مۆبایلەکانمان بکەین، ئەوە دڵنیام هەر ژمارە بیست دەمێنێتەوە.
ئەم قسەیە وتەی ئامۆزایەکی قومارچیمی بیر هێنامەوە، کە دەیگوت (تۆڵە). تۆڵە ناوێك بوو ئامۆزاکەم، لە هەر یارییەکی قوماردا بە خەستی بدۆڕایە، دواپێڕی خۆی دەدایە دەستەوە. منیش لە دوادەرفەتدا تۆڵەی هەموو دۆڕانەکانیم لە بەرامبەرەکانی دەکردەوە.
لە قوماردا، کاتێك گەیشتیتە پێڕی بیستەم، داوای ڕێکەوتن لە بەرامبەرەکەت بکە تا غرور بیگرێت و ڕای بکێشێت بۆ دۆڕاندنێکی خەست.
بێ ئاگادارییی ئەو بنۆڕە ڕوخساری، چونکە لەو کاتانەدا ڕوخسار ئاوێنەیەکە دەتوانیت دەستی بەرامبەرەکەتی تێدا ببینیت.
دەبوو تازە خۆم بدەمە دەست قسەی ئامۆزا قومارچییەکەم.
لای کردەوە بە لامدا و گوتی ئەوەی باسی دەکەیت، گەر وا نەبێت، ئەوا لەوبەری شەقامەکە دادەبەزم و هەرگیز جارێکی تر بیر لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەم ناکەمەوە.
دەستی کرد بە گیرفانی قەمسەڵە ڕەشەکەیدا و کۆدی ژمارە مۆبایلەکەی نیشاندام



(**0770**). لە دڵەوە ئارەزووم لێبوو ئامۆزا قومارچییەکەم لە تەنیشتم بووایە و گازێکم لە لوتی بگرتایە. گەیشتینە کۆتایی شەقامەکە. بە دەستەڕاستدا نیوەپێچێکم کرد بۆ شەقامی بازنەیی مەلیك مەحمود. منیش کۆدی ژمارەی مۆبایلەکەم نیشان دا (**0750**). لەگەڵ پێچکردنەوەدا بە ئاڕاستەی ئەوبەری شەقامەکەدا، داگەڕاین بەرەوخوار.
تەمەکە هێواش هێواش دەڕەوییەوە. مەفرەزەیەکی ئاسایش داوای شوناسیان لێکردین و پاشان هەردوو شوناسەکەیان دایە دەستی ئەو. لەگەڵ بەردەوامیی لێخوڕیندا بە دەنگی بەرز سێ جار گوتی (ڕێکەوت، ڕێکەوت... ڕێکەوت)
چ ڕێکەوتێکی ئاڵۆزە........




پاشان وتی ڕێکەوتی شۆفێر، گەر کۆدی مۆبایلەکانمان لەگەڵ ساڵی لەدایکبوونماندا (**1972**) کۆ بکەینەوە و پاشان لەیەکیان دەربکەین، هەر ژمارە بیست دەمێنێتەوە. بە تیلەی چاو ڕوانیمە شوناسەکەی، ڕاستی دەکرد. هەم ڕێکەوتی ناو بوو، هەم ساڵی لەدایکبوونمان.
کاك ڕێکەوت، باشتر وایە بڵێم ڕێکەوتی سەرنشین، زۆر ساڵی تر هەن، گەر لێدەرکردنیان بۆ بکەیت، هەر ژمارە بیست دەمێنێتەوە. بۆ نموونە ساڵەکانی (**1946ـ1966**) یان (**1968ـ1988**) یان (**1974ـ1994**). ئەمڕۆش بیستی دوانزەیە، کۆتایی وەرزێك و سەرەتای وەرزێکی ترە.
ڕێکەوتی سەرنشین وەك ئەوەی خەمی سینەی بە تەواوەتی ڕەوییبێتەوە، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و دەستی دایە یەکێك لەو دوو کتێبەی کە نامەیەکی بۆری لەسەر بوو، بێئاگاش بوو لە کەوتنی نامەکە بۆ بەر پێیەکانی.
لە بەرگی کتێبەکەدا نووسرابوو (**1984**)، لە ڕێی لەرزینی دەستە شەقار شەقارەکانیەوە هەستم کرد تا دێت شپرزەتر دەبێت. هێواش هێواش دەست بە گێڕانەوەی بەسەرهاتێك دەکات لە ڕۆژگاری (چەپگەر)دا.
ڕێکەوتی ئامۆزام لە سەرەتای ساڵی **1984**دا، چەند ڕۆژێك بەر لە دەستپێکردنی گفتوگۆی نێوان ڕژێمی بەعس و سەرانی شۆڕش، دەستگیر دەکرێ. لە ماوەیەکی کەمدا هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەك لە جەستە و دەروونی دەدرێت، بەڵام هیچ جۆرە دانپێدانانێك پەسەند ناکات.
هەر لە سەرەتای دەستگیرکردنیەوە لەگەڵ مامم، زۆر هەوڵمان دا بە هەر نرخێك بێت، ئازادی بکەین. هەموو شەوێك لەگەڵ مامەمدا بە ماسکۆفیچەکەی بە شەقام و کۆڵانەکانی شاردا، کە

زۆربەی دانیشتوان شەو تا بەیانی بە دیار تایەی سوتاوەوە هەڵدەپەڕین و گۆرانییان دەگوت. لە سۆراخ و گەڕاندا بووین بە دوای دەستڕۆیشتووەکانی ناو شۆڕشدا، تا هەوڵێك بۆ ئازادکردنی فەراهەم بکەین. نایەتەوە یادم چەند ماڵ و ژێرزەمینمان تەی کرد، تا شەوێکیان چاومان بە یەکێکیان کەوت. شەوێك لەو شەوانەی ڕووبەڕووی پرسیاری زۆر بووینەوە. (گەر کوڕەکەتان سەر بە ڕێکخستنەکانی ئێمە بێت، ئەوە بێگومان ناوی لە ناو ئەو ناوە زیندانیکراوانەدایە، کە شۆڕش وەك مەرجی گفتوگۆ دایناون بۆ ئازادکردن. هەر هەوڵێك لە دەستی ئێمەدا بێت، کەمتەرخەم نابین، ئێوە بێخەم بن).

هەموو یەکتربینینەکان جگە لە بەڵێنپێدان هیچی تریان بە دوای خۆیاندا نەهێنا.

شەوێکیان مامەم زۆر پەست دەبێت، کە پێی دەڵێن دەشێ کوڕەکەتان لەسەر شتی لابەلا گیرابێت. مامم بە تووڕەییەوە دەڵێت ئەمە ڕاست نییە، چونکە سزا و جۆری ئەشکەنجەدانی ئەو زیندانەی تێیدایەتی، ئەوە دەسەلمێنێت کە دوورە لە شتی لابەلاوە.

شەوێك لە دەرگای ماڵمان درا، کەسێکی دەموچاوپێچراو بوو، وتی ڕێکەوتی لە زیندان بینیووە، بەر لە ئازادبوونی ئەم نامەیەی پێدا ناردووە.

لەگەڵ کردنەوەی نامەکەدا هیچ گومانم لانەما کە ئەوە دەستوخەتی ڕێکەوتی ئامۆزامە.

نامەکە بە دەستوخەتێکی زۆر ورد نوسرابوو، وەك ئەوەی ئەمە دواهەمین قسەکانی بن لە ژیانیدا کە شیاوی وتن بن.

لە نامەکەدا باسی ئەوەی دەکرد کە زۆر شەو چووە بۆ کۆڵانی ماڵی نیشتیمان. ڕوونی کردبۆوە کە نیشتیمان مامۆستایە لە مەکتەبی وەتەن. ڕێکەوتی ئامۆزام خۆشی دەوێت و یەکلایەنە عاشقی بووە. بڕیاریشی داوە خۆشەویستی خۆی بە وتن و نامە و ڕاسپاردن ئاشکرا نەکات و شتێکی جیاوازتر لە هی ئەویندارانی ئەو ڕۆژگارە بکات. باسی شەوێکی سارد و تەماوی دەکات، کە پەمپێك بۆیەی لە دوکاندارێك کڕیووە. دوکاندارەکەش بە ڕووخۆشییەوە پرسیاری لێدەکات بۆچیەتی و بەمەش ڕێکەوت تووشی شڵەژان و نائارامی دەبێت. دوکاندارەکەش لە کاتێکدا بە وردی لە ڕوخساری ڕاماوە، لە نرخەکەی خۆی هەرزانتر پێی دەفرۆشێت.

درەنگانی شەو ڕێکەوت بە تەواوی هەستوسۆزیەوە لەسەر دیواری کەلاوەکەی



کۆڵانی ماڵی نیشتیمان دەنوسێت (خۆشم دەوێیت نیشتیمان) و هێشتا سەروبۆری بۆ پیتەکان دانەناوە، کە ڕێکەوتی دووگەنجی دەموچاوپێچراو دەکات، کە بە نیازی هەڵواسین و بڵاوکردنەوەی بەیاننامە دزەیان کردۆتە ئەو کەلاوەیەوە، کە سەدان چاڵاوی پڕ لە (جەرەتاو) ئەمسەر بۆ ئەوسەری ڕێگاکانیان داپۆشیووە. لە ناو تاریکیی تەڕ و تووشیدا، لەپڕ دەنگێك تێیان ڕادەخوڕێت. دوو گەنجە دەموچاو پێچراوەکە بەسەر دیواری هەمان کەلاوەدا، زۆر بە کارامەیی خۆیان لە تاریکیی کۆڵانەکەدا بزر دەکەن. ڕێکەوت لە نامەکەدا دەیگوت هیچ گومانم نەبوو، دەنگەکە کەسوکاری نیشتیمان بن. منیش بە دەنگێك کە سەدای لە سینەم دەرنەدەچوو، هاوارم دەکرد (بەڵێ، من نیشتیمانم... نیشتیمانم خۆش دەوێ).

ڕێکەوتی ئامۆزام بێئاگا بوو لەو داوەی کە هەر لە کڕینی پەمپی بۆیەکەوە بۆی چنراوە.

بەرلەوەی دواجگەرەی پاکەتەکەی گڕ بدات، ڕێکەوتی سەرنشین وتی لەو ڕۆژگارەدا، دەوڵەت زۆر قولاپی بۆ ڕاوکردنی نەیارەکانی هەبوو، یەکێك لەو قولاپانە دوکانی بۆیەفرۆشەکان بوو.

لەگەڵ یەکەم نەفەسی جگەرەکەیدا وتی بەڵام ڕێکەوتی ئامۆزام لە نامەکەدا بە هیچ جۆرێك داوای ئەوەی لێنەکردبووین هەوڵ بدەین بۆ ئازادکردنی، لام کردەوە بە لای ڕێکەوتی سەرنشیندا و وتم ئەی دوایی؟

دوای ئەوە بڕیارم دا، بێ ئاگاداریی ماڵی مامەم، سەردانی هەمان دەستڕۆیشتووی ناو شۆڕش بکەم. بەو مەبەستەی داوای نووسراوێکی لێبکەم، ڕێکەوت بکاتە ئەندامی ڕێکخستنەکانیان. بەو مەرجە ڕازی بوو، کە هەر کاتێك لە زیندان ئازاد کرا، لای ئەوان ببێتە ئەندام و هەمان نووسراویش بێ خوێندنەوە و دەستکاریکردن بگەیەنمە دەست بەڕێوەبەری زیندان.

ڕۆژانە سەردانی زیندانەکەم دەکرد، بەڵام هەرجارە و بە بیانوویەك بەڕێیان دەکردم تا کار گەیشتە ڕۆژگارێك، گفتوگۆی نێوان ڕژێمی بەعس و شۆڕش کۆتایی هات و شەڕ هەڵگیرسایەوە. شاڵاوی گرتن خۆحەشاردان و ڕووکردنە شاخ، تەواوی شاری گرتەوە.

دوای چەند مانگێك، شەوێك لە دەرگای ماڵی مامم درا. ئەو شەوە منیش لەوێ بووم. لە ڕێی موختاری گەڕەکەوە ئاگادار کراینەوە سەردانی زیندان بکەین. بۆ ڕۆژی دوایی سەردانی هەمان زیندانمان کرد. گەرچی مامەم تەندروستی زۆر تێك چووبوو و تووشی پوکانەوەیەکی لەناکاو ببوو، کێشی زۆر بە خێرایی دادەبەزی. تەنانەت توانای بیستن و بینینیشی زۆر خراپ بوون.



کاتێك چاومان بە بەڕێوەبەری زیندان کەوت، هەموو قسەکانی ڕوو لە من بوون. لەسەر مێزەکەی هەمان نووسراوی نیشان دامەوە، کە تەنها بەڵگەیە لەسەر ڕێکەوت. ئێوە بە دەستی خۆتان دانتان پێدا ناوە کە کوڕەکەتان سەر بە ڕێکخستنەکانی بەکرێگیراوەکانــــــە.
من لە دۆخی بێئاگایی مامم دڵنیا بووم، کە قسەکانی بەڕێوەبەری بە باشی نەبیستووە، کاتێکیش هاتینە دەرەوە، مامم هیچی لێنەپرسیم و منیش ڕووداوی ناردنی نامەکەم هەر بە شاراوەیی هێشتەوە.
ڕێکەوتی سەرنشین ڕووی تێکردم و وتی تۆ تەنها کەسیت کە ئاگاداری هەموو بەسەرهاتەکەیت. گەیشتینە نزیك مزگەوتی نالی و وتی، ڕۆژی دواتر لە ڕێی هەمان موختارەوە سەردانی زیندانمان کردەوە، تا تەرمی ڕێکەوتی ئامۆزام وەربگرینەوە و بڕە پارەی تێچووی تیربارانکردنەکەشی بدەیــــــن.
ڕێکەوتی سەرنشین کە لە قسەکانی بۆوە، گەیشتینە ئەو فلکەیەی کە بارەگای حیزبی شیوعییە. پاشان لە بەردەم قوتابخانەکەدا ئوتومبێلەکەم خامۆش کرد. ڕێکەوتی سەرنشین دەستی دایە دوو کتێبەکەی و دابەزی، بێ ئەوەی نامەکەی بەرپێی هەڵبگرێتەوە. زەنگی قوتابخانە لێی دا و مامۆستایەکی سەرسپی هاتە دەرەوە، ئەوەندەی گوێم لە قسەکانیان بوو، ڕێکەوت پرسیی ئێرەیە مەکتەبی وەتەن؟ مامۆستا وەڵامی دایەوە، دەمێك ساڵە ئەو ناوە گۆڕاوە. تا ئێستا چەند جارێك ناو لەم قوتابخانەیە نراوە و پاشانیش گۆڕاوە بۆ ناوێکی تر.
کەمێك لە چاوەڕوانیی گەڕانەوەی ڕێکەوتی سەرنشیندا مامەوە، بەڵام ئەو لە ناو هەراوزەنای منداڵاندا بە تەواوەتی ون بوو و نەگەڕایەوە.
کاتێك دەستم دایە زەرفی نامە بەجێماوەکە تا نووسراوەکەی ناوی بخوێنمەوە، لە بەشی خوارەوەی نامەکەدا ناوێکم بەرچاو کەوت، ناوێك هیچ گومانم نەبوو لەوەی یەکەم جارمە بە نووسراوی بیبینم، ئەو ناوەی کە ڕێکەوتی سەرنشین دوای ئەو چەندین ساڵە، دەشێ بێئاگابووبێت لێی، یان کۆدێکی نهێنیی بەسەرهاتەکە بووبێت. لە ڕێکەوتی جوانەمەرگەوە بۆ من (ڕێکەوتی تۆڵە). کاتێك لامدایە باخی گشتی بۆ خوێندنەوەی نامە بەجێماوەکە، لەژێر بەتەمەنترین درەختدا دانیشتم. لەگەڵ هەر جارێك خوێندنەوەدا، وشەکان دەبوونە دوکەڵێکی سپی بە ئاسمانی باخەکەدا.
(قرپەقرپ) لە بەتەمەنترین درەختی باخەکەوە دەگەیشتە گوێم.
کاغەزەکەش دەبووە خۆڵەمێشێك، کە بە هێمنی لە بەینی پەنجەکانمەوە



دەکەوتە سەر ڕووی گەڵا وەریووەکان و تەنها شتێك کە وەکو خۆی دەمایەوە، ئەو ناوە بوو کە لە لۆچی نامەکەدا نووسرابـــــــــــوو.
کزەبایەکی سارد لەو ئێوارە ساردەی زستاندا، وەك پێم بڵێ هەستە برۆ، دەیدا لە ڕوخسارم. گومانم کرد ڕێکەوتی جوانەمەرگ کەسێکی خۆش ویستبێت بە ناوی مامۆستا نیشتیمان، بەڵام ڕێی تێدەچوو نیشتیمان تەنها لە خەیاڵ و فەنتازیای ڕێکەوتی سەرنشینەوە سەری دەرهێنابێت و هیچ ڕاستیەکی لە پشتەوە نەبێت.
لەگەڵ هاتنەدەرەوەم لە باخی گشتی، ئەو سەدان لافیتەیەم بەرچاو کەوت، کە لە شەقام و شوێنە گشتییەکاندا هەڵواسرابوون.
بە شێوەیەك تووشی شۆك بووم، خەریك بوو خۆم بکێشم بە قەی درەختێکدا.
هەمان ناوی لۆچی ناو زەرفی نامەکە لە شێوەی نەخشێکی گەورەدا لەسەر لەپی دەستم دەرکەوتبوو.
کاتێکیش لامدایە لای عەرەبانچییەك تا چایەکی دژلەمە بخۆمەوە. بێژەری ڕادیۆکە باسی لە مەرگی لەناکاوی گەورەبازرگانێك دەکرد، کە لە دوای ڕاپەڕینەوە بەشێکی زۆری دەزگا حیزبی و حکومییەکان و باڵەخانەکان، لە ڕێگەی کۆمپانیا بە ناوبانگەکەی ئەوەوە ڕەنگ کراون.
تەنانەت ئەو قەڵەم و ڕەنگ و بۆیانەش کە منداڵان وێنەیان پێ کێشاوە و بۆیەی ئاوی و زەیتی و بۆیەی ئارایشتگاکانیش، هەر لە لایەن هەمان بازرگانەوە هاوردەی وڵات کراون.
بێژەرەکە بەر لەوەی کۆتایی بە وتارە خەمئامێزەکەی بهێنێت، باسی خەونی ئاییندەی بازرگانەکەی دەکرد، کە بە نیاز بووە تەواوی کێل و چەرداخ و گومەزی گۆڕستانەکانی شار نوێ بکاتەوە. بەڵام بە داخەوە، ئەو خەونەی نەهاتە دی و سەرلەبەیانیی ئەمڕۆ کاتژمێر دە و چلوپێنج خولەك بە ڕووداوی ئۆتومبێل، لە نزیك کارێزی وەستا شەریف، گیانی سپارد بە خاکی کوردستان. سبەی سەرلەبەیانییەکەی لە گۆڕستانی (شە...). زەنگی مۆبایلەکەم لێی دا و دەنگێك کە هەر بە دەنگی ئامۆزا قومارچییەکەم دەچوو، بە قوڕگێکی پڕ لە گریانەوە دەیگوت، تۆ لە کوێی ئامۆزا تۆڵە......
تۆ لە کوێی، لە کوێ.

**پێشکەشە بە هەمان سەرنشینی ڕێکەوتی 20/2/2013**
**07701212197**






# خەڵاتی نۆبڵی ٢٠١٤ بەخشرایە نووسەرێك، کە لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆی زۆر کەم دەخوێنرێتەوە.

وەرگێڕان و ڕانانی: سورمـــه

ساڵی ١٩٤٥ لە باوکێکی یەهودیی ئیتاڵیایی و دایکێکی بەلژیکی لە پاریسی پایتەختی فەڕەنسا لەدایك بووە، مۆدیانۆ لە سەروبەندی شەڕی دووهەمی جیهانیدا چاوی بە دونیا هەڵهێناوە، خوێندنی ناوەندیی بە هاوکاری دەوڵەت تەواو کردووە، پاشان وانەی ئەندازەسازیی لە قۆناغی دواناوەندی لە لای ڕیمۆن کونۆ، شاعیر، ڕۆماننووس و درامانووس خوێندووە، بەم شێوەیەش، یەکەم پێنگاڤی بەرەو دونیای ئەدەب هاوێشت.

مۆدیانۆ لە ساڵی ١٩٦٨دا یەکەم ڕۆمانی خۆی بە ناوی (شوێنی ئەستێرەکان- **La Place de l'Étoile**) بڵاو کردەوە، کە دواتر بووە سیناریۆی دوو فیلم. هاوکات ڕۆمانەکە وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئەڵمانی. هەر لەو ساڵەدا پاتریك

مۆدیانۆ به شایانی خەڵاتی نۆبڵ بینرا.

"زمانی ساده و ڕستەی کورت" دوو تایبەتمەندین کە "شێوازی نووسینی مۆدیانۆ"یان پێدەناسرێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، پێدانی خەڵاتی نۆبڵ بە پاتریك مۆدیانۆ جگە لەوەی شۆكێك بوو، زۆربەی ڕەخنەگرانی ئەدەبیش گوزارەی پێدانی خەڵاتەكەیان لە نێو خۆیاندا بەم ڕستەیە و بە تەنزەوە دەماودەم دەكەن: "خەڵاتی نۆبڵی ٢٠١٤ بەخشرایە كەسێك، كە لە دەرەوەی وڵاتەكەی خۆی زۆر كەم دەخوێنرێتەوە".

مۆدیانۆ نووسەری ڕۆمانە تاریكەكانە. دەكرێ ئەم تاریكییە بشوبهێنرێ بە ناوەڕۆكی فیلمەكانی دەیەی پەنجاكانی سەدەی ڕابردوو. خوێنەر لە ناونیشانی ڕۆمانەكانییەوە بەر ئەو تاریكییە دەكەوێت: "ئێشكگری شەوانە- **La Ronde de nuit**"، "ڕووداوی شەو- **Accident nocturne**"، "چیمەنی شەو- **L'herbe de nuit** ".

هەر لە ناونیشانی سەر ڕووبەرگی كتێبەكانییەوە سەرەداوێكمان لە ناوەڕۆكی كتێبەكانی دەست دەكەوێ و دەزانین نووسەر لە ڕۆمانەكانیدا بە دوای چییەوەیە، لە ڕۆمانی "ماڵی خەمگین- **Villa triste**"ـەوە بگرە تا ڕۆمانی"گەنج- **Unejeunesse**" و "شریتی یادەوەری" دەكرێ لە ناونیشانەكانییەوە شتێكمان لە بارەی ناوەڕۆكی ڕۆمانەكانییەوە پێبڵێن.

دیوێكی دیكەی ناسینەوەی ڕۆمانەكانی مۆدیانۆ ناسینەوەیەتی لە ڕێگەی گێرەڕەوە- **narrative**ی ڕۆمانەكانی، كە زۆربەیان بە جێناوی كەسی یەكەمی تاك "من" گێڕدراونەتەوە، بەڵام ئەم شێوازە لە گێڕانەوە، یاخود ڕۆڵپێدان بە خودی خۆی بۆ گێڕانەوەی ڕۆمانەكانی زۆرجار وەك ئاماژەیەكە بۆ گوزارشتكردن لە ڕابردوو، بەتایبەت ئەو هەستە پەنهان و شاراوانەی لە خودی گێڕەرەوەدان، نەك هەر ئەمە، بگرە خودی جێهێشتنی مەودا و بۆشایی نێوان ڕستە و پەرەگرافەكانیش گوزارشتێكی ڕوونن لە كات و دەكرێ لە شێوازی نووسینی هەندێك ڕستە و وشەدا وا لە خوێنەر بكات تا جۆری دەنگیش ڕۆڵ ببینن وەك ئێلێمێنتێكی تەواوكار لە پرۆسەی خوێندنەوەدا.

ئەدەبێك زادەی بێدەنگی

لە چیرۆكەكانیدا، پاتریك مۆدیانۆ دەكەوێتە وێزەی ئاماژە بایۆگرافی و ڕایەڵە مێژووییەكانەوە و ئەمەش بەشێكی زۆری ئێتمۆسفیری دەقەكانی پێك دەهێنێت، بەڵام لە ڕۆمانەكانیدا بە لای بایۆگرافی و ڕەهەندی مێژوویيدا ناچێت، سەرەڕای ئەمەش، دیسانەوە بۆ تێگەیشتن لە ڕۆمانەكانی دوو زانیاریی گرنگ هەن، كە فەرامۆشنەكراون، ئەویش

باسی باوکی و بیروباوەڕەکەی وەك یەهودییەك. لە زۆربەی ڕۆمانەکانیدا بە جێناوی کەسی یەکەمی تاك "من" حیکایەتخوانیی ڕۆمانەکانی دەکات. لە ڕۆمانەکانیدا خەیاڵ و ڕاستی هاوشێوەی ئەدەبی پۆستمۆدێرن بە چڕی تێك ئاڵاون و ناسینەوەی سیمایان ئاسان نییە، بە هەمان شێوە بەیەکداچوون لە نێوان درۆ و ڕاستییشدا هەیە و لە زۆربەی دەقەکانیدا درۆ و خەیاڵکاری بە ناوی ڕاستیی ڕەهاوە دەخاتە ڕوو، بەڵام بە لێزانانە و شارەزاییەکی پتەوەوە.
ئەگەر پرسیاری ئەوە بکرێت ئاخۆ مۆدیانۆ شایانی ئەوە بوو ببێتە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ؟ ڕەنگە شیاوترین وەڵام ئەوە بێت بڵێین: ئەگەر ڕۆمانەکانت نەخوێندبێتەوە ڕەنگە وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ لە لایەن مۆدیانۆوە تا ئاستێکی بەرز چاوەڕواننەکراو بێت. بەڵام دوای خوێندنەوە ڕۆمانەکانی، پێدانی خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەبیات بۆ ساڵی **2014** بە مۆدیانۆ مایەی سەرسامیت نابێت.

سەرچاوەکان:


http://www.thisdaylive.com/articles/patrick-modiano/192160/

http://www.slate.com/blogs/browbeat/2014/10/09/patrick_modiano_wins_nobel_prize_these_are_his_three_best_books.html

http://www.francetoday.com/articles/2011/11/15/patrick_modiano_literary_giant.html

# پاتریك مۆدیانۆ

## فلاش باك دوای وەرگرتنی نۆبڵ

**بەیان سەلمان**

لە خەڵاتی نۆبڵی ساڵی ٢٠١٤ لە مانگی تشرینی یەکەم، ئوکتۆبەر، ناوی پاتریك مۆدیانۆ بە یەکسانی لەگەڵ ناوی نووسەری ژاپۆنی هاروکی موراکامی و نووسەری کینیایی نیگی وا تیۆنگۆ پاڵێورابوو.
پاڵاوتنی پاتریك مۆدیانۆ بۆ خەڵاتی نۆبڵ، هەروەك پێشتر هاووڵاتی وڵاتەکەی ژان - ماری گۆستاڤ لوکلیزیۆ، بوو بە مایەی سەرسووڕمانی خەڵکی. وەك چۆن سەرسووڕمانی نووسەر خۆشی کەمتر نەبوو، کە لە شەقام بوو هەواڵەکەی پێگەیشت. زۆر نین ئەوانەی ئەم نووسەرەیان خوێندۆتەوە، زۆر کەمیش بوون ئەوانەی پێشبینیی وەرگرتنی نۆبڵیان بۆ دەکرد؛ ئەگەرچی مۆدیانۆ لە ناو وڵاتەکەی خۆی چەندین خەڵاتی جیاوازی وەرگرتووە، بەناوبانگترینیان خەڵاتی گۆنکورە، کە لە ساڵی ١٩٧٨دا لەسەر ڕۆمانی شەقامی دوکانە تاریکەکان خەڵات کرا. خاوەنی نزیکەی سی کتێبە لە نێوان ڕۆمان و نۆڤلیست و دەق بۆ منداڵان و چەند پارچە شانۆگەرییەك و سێناریۆ و هەوڵی نووسین (ئازمایش) و نووسینی کۆمەڵێ گۆرانی. بە هەموو ئەمانەشەوە سەرچاوەی لێکۆڵینەوە لەسەر دەقەکانی ئێجگار کەمن بە بەراورد

بە هەندێ نووسەری تر کە خەڵات نەکراون، یاخود فرۆشتنی کتێبەکانیان لە ئاستێکی بەرزدایە.
مۆدیانۆ لە ساڵی ١٩٤٥ لە بولۆنیە ـ بیانکور لە فەڕەنسا لەدایك بووە. ناوی باوکی ئەلبێر مۆدیانۆ، بە ڕەچەڵەك جوولەکەیە، باوکی ئەلبێریش کۆچبەرێك بووە کە لە تۆسکانیی ئیتاڵیاوە بەرەو ئەسکەندەریە و دوایی ئیسپانیا و دواجار لە پاریس گیرساوەتەوە. ئەلبێر مۆدیانۆ لە تەمەنی سی ساڵیدا، لە کاتی داگیرکردنی فەڕەنسا لە ساڵی١٩٤٢دا لە لایەن نازییەکانەوە، لە پاریس چاوی بە لویزا کۆلپین کەوتووە و بوونەتە هاوسەر. لویزای دایکی پاتریك بە ڕەچەڵەك فلاماندە-بەلجیکییە؛ ژنەئەکتەرێکی سینەما و شانۆیە، ئەمەش ئەو لایەنە لە خولیای مۆدیانۆ بۆ نووسینی چەندین سیناریۆ و دەرهێنانی فیلم ڕوون دەکاتەوە.
یەکەم ڕۆمانی مۆدیانۆ لە ساڵی ١٩٦٨ لە خانەی چاپەمەنیی گالیمار بە ناونیشانی "گۆڕەپانی ئیتوال-**La Place de l'Étoile**" چاپ کرا. وشەی ئیتوال لە زمانی فەڕەنسیدا بە مانای ئەستێرەیە. لە هەمان کاتدا ئاماژەیە بۆ ئەو گۆڕەپانەی پاریس، کە بە "تاقی سەرکەوتن" ناسراوە، هەروەها بۆ ئەو ئەستێرە زەردەی لە کاتی نازییەکاندا بەسەر سینگی جولەکەکانەوە قایم دەکرا. لە ڕووی ڕەمزییشەوە بۆ دۆخی وێڵیی کەسایەتییەکەش دەگەڕێتەوە، کە نازانێ و ناشتوانێ شوێنی خۆی لە جیهاندا دیاری بکات. گرنگە ئاماژە بەوە بکەین کە نیوەی ناوی کەسایەتیی سەرەکیی شلیمیلۆڤیتش**schlemiel** لە زمانی یەدیشی جوولەکە بە واتای دژە-پاڵەوان دێت. ئەم ڕۆمانەی مۆدیانۆ دەقاودەق هەمان ناونیشانی شانۆگەرییەکی شاعیر و نووسەری فەڕەنسی ڕۆبێرت دسنوسە. هەربۆیە پاتریك مۆدیانۆ لە کتێبی "دۆرا برودەر" **Dora Bruder** کە لە ساڵی ١٩٩٧دا چاپ کراوە، لەسەر زمانی گێڕەرەوەی ڕووداوەکانەوە ئاماژە بەم هاو-ناونیشانە دەکات، کە ڕۆمانی یەکەمی ناونیشانەکەی هەڵگرتووە.
دەسپێکی ڕۆمانەکە "گۆڕەپانی ئیتوال"، بە ڕستەیەك دەکرێتەوە بەسەر ڕووداوەکان، کاتێ ئۆفیسەرێکی نازی لەسەر شەقام لە پیاوێك دەپرسێ: "بێزەحمەت بەڕێز، گورەپانی ئیتوال کەوتۆتە کام لا؟" پیاوەش دەست بۆ لای چەپی سینگی دەبات. ئەم ڕۆمانە تێکەڵەیەکە لە ژیاننامە و خەیاڵ، بە کەسایەتی یەکەمی تاك "من" ڕووداوەکان دەگێڕدرێنەوە. ڕافائێل شلیمیلۆڤیتش خۆی کەسایەتیی سەرەکییە و گێڕەرەوەی چیرۆکەکەشە. پیاوێکی جوولەکەی فەڕەنسییە، کە لە پاش شەڕ لەدایك بووە. ئەگەرچی ئەوانەی خوێندنەوەیان بۆ ئەم دەقە کردووە، کەسایەتیی شلیمیلۆڤیتش بە کەسێك دادەنێن، کە وڕێنە دەکات، بەڵام ڕاستییەکەی وەها نییە. ئەم کەسایەتییە ژیانی پڕ مەترسییە و بە ناچاریی شوێن دەگۆڕێ و دەچێتە پێستی چەندین کەسایەتییەوە.



ئەمەش گرفتی شوناسی بۆ دروست دەکات. لە هەمان کاتدا ناتوانێ ئەو شوناسە بە خۆیەوە بنووسێنێت و ناشتوانێ لێی جودا ببێتەوە. ئەم کەسایەتییە ئەوەندەی ونبوونی شوێنی لە ناو ڕاستیدا وای لێدەکات ئێستا و ڕابردوو تێکەڵ بکات و قسەکانی و گوتارەکانی ببنە ورێنە، خودی خۆی وەك پیاوێك ورێنە ناکات، ئەمەشە کە بەرەو ئەو لایە ئاڵۆزە دەمانبات کاتێ لە ناو دەقەکەدا بە کەسایەتیی ڕۆژ بەراوردی دەکەین، کە دایکی ڕۆژ بە ڕاستی ورێنە دەکات و ناتوانێت لە دووفاقیی یادەوەریەکانی لە نێوان ئێستا کە وای لێهاتووە و لە نێوان ڕابردوو کە بەردەوام بە ڕووداوە تاڵەکانی لە مێشکیدا ئامادەیە، دەربازی بێت. هەربۆیە یادەوەریی دەستەجەمعی بە زۆری ئامادەیە و بەتایبەتی گرێ دراوە بە کۆمەڵێ شوێنەوە، کە کەسایەتییەکان لێی ژیاون، یان کەسێکیان مردووە، یاخود کارەساتی سەخت لەوێ ڕووی داوە و دەبنە بەشێك لە مێژووی کەسایەتییەکان. هەر خودی مێژووی کەسێك بەبێ بوونی دەوروبەری بوونی نییە؛ کەس لە ناو کەسانی تر دەژی، چی دەکات، چۆن هەڵوێست وەردەگرێت و چی بەسەر دێت. هەر چۆن دورکهایم باس لەوە دەکات کە "(...) خەونەکانمان بەو یادەوەرییانە پڕن، کە لە ڕابردوودا ژیاوین و لە ناو خەونەکانماندا دەبنەوە بە ڕووداوی دوێنێ و پێرێ، بەڵام لە ڕاستیدا یادەوەری قایمی کردوون و لە ڕێی خەونەوە بەرهەم دەهێنرێنەوە".
لە ڕۆمانی دووهەمیدا "دەورانی شەو" **La ronde de nuit** کە لە ساڵی ١٩٦٩ چاپ کراوە، لە بەرگی پشتەوەی ڕۆمانەکە نووسراوە: پاڵەوانی چیرۆکەکە پرسیاری ئەوە لە خۆی دەکات چۆن دەبێتە خاین و چۆن نابێت؟ کەسایەتییەکە لە هەمان کاتدا هاوکاریی گیستاپۆی فەڕەنسی دەکات و هاوکاری تێکۆشەران و بەرگریکەرانە و ئەمە بەرەو شەهیدبوون دەیبات، وەك تاقە چارەسەرێك بۆ دەرچوون لەو پێچەخەمەیە.
مۆدیانۆ بەوەی زۆرینەی کارەکانی مێژوو دەوروژێنن، بەڵام بەرهەمەکانی بە خەیاڵی لە قەڵەم دەدرێن؛ بەتایبەتی مێژووی فەڕەنسای ساڵانی چلەکان لە کاتی داگیرکردنی ئەو وڵاتە لە لایەن نازییەکانەوە. ناوی کەسایەتییەکانی مۆدیانۆ لە ژیانی ڕاستییەوە هاتوون، هەریەکەیان مێژووی خۆی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە و هەست بە بێگانەییان ناکەین. یادەوەری لە ژیانی مۆدیانۆدا زۆر گرنگە، یادەوەریی کەسوکار و خێزان و وڵات لە هەموو کارەکانیدا ڕەنگ دەدەنەوە. هەربۆیە ئەو پسپۆڕانەی شارەزای بەرهەمەکانی مۆدیانۆن، پێ لەسەر ئەو پەیوەندییە گرنگە دادەگرن، کە لەگەڵ مێژوودا هەیەتی و چۆن بە لایەنی خەیاڵەوە گرێی داوە. جگە لە گواستنەوەی ئەو ترۆمایەی جوولەکەکان پێیدا تێپەڕین و دیسان داڕشتنەوەیان بە شێوەیەکی داهێنەرانە.
بە خوێندنەوەی هەر دەقێکی مۆدیانۆ ناتوانین ژیاننامەی نووسەری لێ دەربهێنین؛ ئەگەرچی بیناکردنی کەسایەتییەکان کە لە ژیانی ڕاستییەوە هاتوون و نیشتەجێبوونیان لە ناو دەقی ڕۆمانێك لایەنی دەقی خەیاڵی ڕووت

بەدوور ناگرێت. بەم شێوەیە، مۆدیانۆ لە ژیاننامەوە بۆ ژیاننامەی خود و بە ئەندێشەکردنی خود بەشێکی هەرە گەورەی ڕووداوەکانی ڕۆمانەکانێتی.
کتێبەکانی مۆدیانۆ هەموویان زۆر کورتن. لە چاوپێکەوتنێکی مۆدیانۆ لە ساڵی ١٩٦٩ بۆ گۆڤاری ئەدەبی فەڕەنسی، لە پاش دەرچوونی دووهەم ڕۆمانی دەڵێ: "(...) دەسپێکی نووسینم بە کۆمەڵێ هەڵبەست بوو، چەند جارێك هەوڵم دا ڕۆمان بنووسم، بەڵام نەمەتوانی لە چل لاپەڕەیەك تێپەڕم، هەتا هاوینی ساڵی ١٩٦٦ کە گۆڕەپانی ئیتوالم نووسی.". ئەم بەشە کورتە لەو چاوپێکەوتنە ئەو لایەنە لە کورتیی کارەکانی مۆدیانۆ ئاشکرا دەکات.
لە زۆربەی ڕۆمانەکانی مۆدیانۆدا هەر سێ فیگەری سەرەکیی جوولەکە، نازی، هاوکاریی نازییەکان، دووبارە کراونەتەوە. لەو بوارەوە لە هەمان چاوپێکەوتندا لێی دەپرسن ڕات چییە بەم سێ فیگەرە لە کۆنتێکستی ساڵانی ١٩٤٠ بۆ ١٩٤٤؟ مۆدیانۆ وەها وەڵامی داوەتەوە: "(...) جوولەکە، کەسێکی ئابڵۆقەدراوە، کە ناچارە ڕاستیی خۆی بشارێتەوە بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لە ژیان. نازی بە هەموو هێمایەکی هێز کە بە ڕووکەش بە خۆی داوە، تا بڵێی لە ناوەوە لاوازە، چێژێکی بۆ ڕێوڕەسمی پرسە هەیە و دەربڕینی دڵڕەقیی بە جۆرێك شێواوە. هاوکاریی نازییەکان، ئەمە ئەوەندەی حاڵەتێکی فیکرییە، شێوازێکە لە بوون، هەڵبژاردنێکی سیاسی نییە. تێکشکانی فەڕەنسا جۆرە تۆڵەسەندنێکی لە لای پەراوێزکراوەکان بەئاگا هێنا؛ ئەوان ئامادەگیی کەشوهەوایەکی سروشتیی داگیرکردن بوون...".
ستروکتوری دەقەکانی مۆدیانۆ لە موزیك بەدەر نین. لە نێوان ڕستەکانیدا ئەو موزیکە دەبیستین، کە بابەتەکانی لەسەر دارِشتۆتەوە، بەڵام ئەمە دەقەکانی یەکڕەنگ نەکردووە، بەڵکو هەر دەقێکی تایبەتمەندیی خۆی هەیە، چونکو گرنگیی دەقەکانی پەیوەستن بە باسکردنی هەموو ئەو ماوانەی پێش لەدایکبوونی مۆدیانۆ، واتە ڕووداوێك دەگێڕێتەوە و هەڵگری کۆی یادەوەرییەکە، کە لە بنەڕەتدا خۆی ئامادەگیی تێیاندا نەبووە. ئەم شەڕە گەورەیەی مۆدیانۆ لە نێوان ڕابردوو و چرکەی ئێستای نووسین شەڕێکی گەورەیە لەسەر تەختی ڕووداوەکان و بەڵگەنامانەی ئەو ترۆماییانە دەخاتە ڕوو، کە لە نەستی کەسایەتییەکاندا ڕەنگ دەدەنەوە.
بە خەیاڵکردنی ڕووداوەکان ئەو لایەنەی بۆ مسۆگەر دەکات، کە خۆی لە هەموو ڕووداوەکان و ترۆماکانیان بدات؛ توانای چوونە ناو ئەو گەڕەگ و قاوەخانە و ماڵانە و تەنانەت ناواخنی کەسایەتییەکانیشی پێدەدات، کە لە سنووری ژیانی ڕاستی دەریان دەکات و ئەو ڕووداوانەی کە بە بابەتی ژیانی ڕاستین و لە چوارچێوەییەکی تەسکدا بەند کراون، ئەو



بە خەیاڵ هەڵیاندەوەشێنێت و دەیانکاتەوە. مۆدیانۆ لە ڕووداوە ڕاستییەکانەوە پانتاییەکی نوێ بەسەر خودی ڕاستی دەکاتەوە و سەرجەمی ڕووداوەکان هەڵدەگێڕێتەوە بۆ ناو دەقی خەیاڵ. هەر ئەم ڕاستییانەشن کە خۆیان لە پانتایی دەقی خەیاڵیی دەکەنەوە و هەرچی پێی دەڵێن کۆپی دەقاودەقی ڕاستی، ڕەت دەکاتەوە.

مۆدیانۆ لە سەرجەمی دەقەکانی یان زۆرینەیاندا خودی کات لە سەردەمی شەڕ و داگیرکردن وەك فاکتەرێکی سەربەخۆ مامەڵەی کردووە. کات ئەوەیە کە بە نێو ئەزموونی تێکشکانی کەسایەتییەکاندا تێدەپەڕێت لە ساتەوەختێکی ناڕەحەتیی دەروونی و نەهامەتی ژیانیان؛ هەرچی ئەو تێکشکانەیە، پارچەپارچەیە، پەرتوبلاوە، تا ڕادەیەك نادیارە و بە جۆرێك کۆ دەکرێنەوە، کە جارێکی دی بکەونەوە بەرچاو. بەم شێوەیەش ڕووداوەکان دەگۆڕێن بۆ یەکەیەکی تۆکمە لە کاتدا، ئەمەش لە لای خۆیەوە واتا بەو کات و سەردەمە دەدات، کە فلان ڕووداو باس کراوە. هەر بەم جۆرەش مۆدیانۆ ڕەقیی ڕاستی لە دەقێکی گۆڕاو بۆ خەیاڵ نەرم کردۆتەوە. لە ڕاستیشدا ئەو جۆرە دەقە وەك ئەوەیە، کە لە جیهانێکی ترەوە، لە ڕاستییەکی زۆر دوورەوە پێمان بگات و لە ناو دەقەکە لە هەنوکەدا ڕووداوەکانی بژێینەوە. ئا لێرەشدا ئەم جۆرە دەقانەی مۆدیانۆ وامان لێدەکات وەك هەموو دەقێکی خەیاڵی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین و لەو ساتەوەی چاومان بە لاپەڕەی یەکەمی هەرچ کتێبێکی بکەوێ، قبوڵی ئەو لایەنەی بکەین، کە خەیاڵێکی ڕاستییە، چونکو ئەو جیهانانەی لەبەردەستن و بەئاگایە لێیان و شارەزایی لەبارەیانەوە هەیە، جیهانی تریان لێوە دادەهێنێت.

سەرچاوەکان:


Elisabetta Sibilio, La Porte de l’ombre. Regards sur l’œuvre de Patrick Modiano, Acta fabula, - .vol. 9, n° 5, Mai 2008, URL

Émile Durkheim, Les Formes élémentaires de la vie religieuse : le système totémique en - .Australie, Essai, Ed. PUF, Paris, 1912

.Le Magazine Littéraire, Hors-Série, À la recherche de Patrick Modiano, N°2, Octobre 2014 -

Revue de L’Histoire, Patrick Modiano ôte le masque, Portraits - par Anna Bitton dans - .mensuel n°299 daté juin 2005 à la page 32



# نووسەر جۆرێکە لە ڕووناکی!

# پەیامبەر و مژدەهێنەرە

**پاتریک مۆدیانۆ**

**و. لە سویدییەوە: گۆران مەریوانی**

دەخوازم بە سادەیی پێتان بڵێم، من زۆر بەختەوەرم کە لێرە لەگەڵ ئێوە کۆ بوومەتەوە و دڵشادم کە خەڵاتی نۆبێڵتان لە ئەدەبدا، بە من بەخشیووە. یەکەم جارە من لە بەردەم کۆمەڵە خەڵکێکی زۆردا کە کۆ بوونەتەوە، گوتار دەدەم و کەمە ترسێکیشم لێنیشتووە. ڕەنگە مرۆڤ وابزانێ گوتاردان بۆ کەسێ کە دەنووسێ، کارێکی سووك و ئاسان و سروشتییە. لێ نووسەر –لایەنی کەم ڕۆماننووس– سەروسەوداکردنی لەگەڵ وشەی بەزارهاتوودا، ئەغڵەبەن، پێ سەختە. ئەگەر مرۆڤ، بە پێوەری قوتابخانە، جیاوازی لە نێوان وشەی نووسراو و گوتراودا بەکار بێنێ، ڕۆماننووس بەهرەیەکی گەورەتری هەیە بۆ وشەی نووسراو. ئەو، نووسەر، زۆربەی جار بێدەنگە و گەر بیەوێت ئاتۆمسفێرێك بیپێکێ، دەبێ ڕێ بە خۆی بدا تا دەنێو ئاپۆرەی خەڵکیدا بتوێتەوە. بێ ئەوەی کەس هەستی پێبکا، گوێڕادێری

گفتوگۆی مرۆڤان بێ، خۆ گەر دەخاڵەتێ بکا، تەنێ بۆ ئەوەیە تا چەند پرسیارێکی دڵسۆزانە بکا، تا باشتر لە ژن و پیاوانی دەوروپشتی تێبگات. ئەو بە دوودڵییەوە قسان دەکا، چونکە ئولفەتی گرتووە بە ڕەشنووس و پاکردنەوەی لە هەڵەکانی. دوای چەندەها لابردن و سڕینەوە، ئەوجا شێوازێك کە ئەو هەیەتی، بە ڕاستی دەکرێ گەلاڵە بێ، بەڵام کە گوتار دەبێژێ، پاشان هیچ دەرفەتێکی بۆ نایەتە پێش تا دوودڵییەکەی تێدا بڕەوێنێتەوە.

ئەوجا من بۆ خۆشم سەر بە نەوەیەکم، کە بە منداڵی گوێ لە دەنگ و سەدایان نەدەگیرا، لە هەندێ هەل و دەرفەتی دەگمەندا نەبێ، ئەویش دوای ئەوەی، پێشوەخت، داوایان دەکرد مۆڵەتی ئاخافتنیان پێبدەن. مرۆڤ گوێی بەوان نەدەدا و زووزووش قسانی پێدەبڕین. هەر ئەمەش گرفتی ئاخافتن و زمانگرتن لەکن زۆربەمان ڕوون دەکاتەوە، کە زۆرێ لە ئێمە هەنووکە گرفتارێتی. ئێمە گاهێ دوودڵین، گاهێ بە خێرایی دەپەیڤین، وەکو ئەوەی ترسمان لێنیشتبێ، کە ها ئێستا یان تاوێکی تر، قسەکانمان پێدەبڕن. پێدەچێ لەبەر ئەوەش بێ من، خەڵکانێکی زۆریش لەگەڵ مندا، لە کۆتایی قۆناخی منداڵیدا گرفتاری دەردی نووسین بووین. بەو ئومێدەی ئەوەی کە نووسیومانە، گەورەساڵان بیخوێننەوە. ئەودەم ناچارن گوێڕادێرن لێمان بێ ئەوەی قسانمان پێببڕن و چی لە دڵیشماندایە، دەرببڕێت.

ئەودەم، کە خەڵاتەکە ئاشکرا کرا، بە لای منەوە لەوە نەدەچوو ڕاست بێ، پێم خۆش بوو بشزانم بۆچی منتان هەڵبژاردووە. ئەو ڕۆژە، زۆر بەهێزتر لە جاران، هەستم دەکرد ڕۆماننووس چەند نابینایە لە ئاست کتێبەکانی خۆیدا و خوێنەریش چەند زیاتر شارەزایە لە خودی ئەو، بەوەی ئەو چیی نووسیووە. هەرگیز ناکرێ بۆ ڕۆماننووسێ ببێتە خودی خوێنەری خۆی، بەدەر لەو کاتانەی هەڵە ڕێزمانییەکانی ڕاست دەکاتەوە، وشە دووبارەبووەکان و بەشە زێدەکان لادەبات. ئەو تەنێ وێنایەکی تەڵخ و ناتەواوی لە کتێبەکانی خۆی لایە، بە وێنەکێشێکی فرێسکۆ دەچێ، کە لەسەر داربەندی بینایەك درێژ بووە و سەرقاڵی وردەکاریی کارەکەی خۆیەتی بێ ئەوەی تەواوی ئەو وێنەیەی کە دەیکێشێ، لە پێشچاوی بێ.

نووسین کارێکی ناوازە و سەیرە. ناوەناوە، دەمێ دەست دەدەیتە نووسینی ڕۆمانێ، نائومێدییەك دەتگرێ، هەستێکە ڕۆژانە هەمیشە و بەردەوام دێتەوە لات بەوەی گوایێ دڕ بە ڕێگایەکی هەڵە و غەشیمانە دەدەیت. فریوودانەکە لەوەدایە بچیتەوە دەستپێك و سەرلەنوێ ڕێگایەکی تر بگریت. لێ نابێت فریوودانێکی ئاوها لە خشتەت بەرێت، بەڵکو دەبێ لەسەر ئەو ڕێگایەی ڕێچکەیت شکاندووە، درێژە بدەیت. کەمێ بەوە دەچێت، کە لە گەرمەی زستانێکی تاریك و نووتەکدا ترۆمبێل بئاژوویت، دەمێك زەمین خلیسکە و بەرچاو نادیار. ئیدی مرۆڤ هیچ بژاردەیەکی بۆ نامێنێتەوە، ناشکرێت بگەڕێیتەوە. بەڵکو دەبێ درێژە بە ئاژووتن بدەیت و قەناعەت بە خۆت بکەیت، کە تەمومژ دەڕەوێتەوە و

ئیدی ڕێگاش کەم کەم، هێدی هێدی بۆ ئاژووتن لەبار دەبێت.
ساتەوەختێ، ئیدی کە دەست لە کتێبێك بەردەدەی و دەیگەیێنیتە کۆتا، کتێب لە دەست تۆ خۆی ڕادەپسکێنێ و کۆشش دەکا دەرباز بێ، پێشوەخت، زوو ئازادیی خۆی بە دەست بێنێ، بە ئاخر ڕۆژانێ دەچێ، کە منداڵێ چاوەڕوانی کۆتایی قوتابخانەیە، پێش هاتنی پشووی هاوین. ئەودەم ئەوان، مندالان، ناتوانن مێشکیان جەم کەن، سەرقاڵی هەراوهوریان و گوێ بە مامۆستا نادەن. بەڵێ، دەمەوێ بە ڕاشکاوی بڵێم، لە سەروبەند و ساتەوەختی نووسینێکدا، دەمێ مرۆڤ دوادێڕانی کتێبەکەی دەنووسێ، ئەودەم کتێب دەبێتە نیمچەملۆزمێك و حەماس دەیگرێ، تا چ زووترە خۆی لە دەست نووسەر دەرباز بکا.
بەڵێ، خوێنەر زیاتر دەربارەی کتێب و نووسەرەکە خۆی دەزانێ. دیاردەیەك، دە نێوان ڕۆمانەکە و خوێنەر، خۆی قوت دەکاتەوە، دەکرێت بە پرۆسێسی شوشتنەوەی فۆتۆگرافی بشوبهێنین، شێوەیەك کە پێش سەردەمی بەدیگیتاڵیکردنی فۆتۆ باو بوو. فۆتۆ هێدی هێدی، لە گەرمەی شوشتنەوەدا، لە ژوورێکی تاریکدا، کەم کەم خۆی نیشان دەدات. کاتێ ڕۆمانێك دەخوێنینەوە، هەمان پرۆسێسی کیماگەرایی ڕوو دەدات. جا تا ئەم لێکحاڵیبوونەی نێوان ڕۆماننووس و خوێنەر بە ئەنجامێك بگات، نابێت نووسەر هەرگیز زۆر لە خوێنەری بکات -هەروەکو چۆن نابێت سترانبێژ زۆر لە دەنگی خۆی بکات- بەڵکو دەبێت لەگەڵ خۆتدا هەنگاو بە هەنگاو، بێ ئەوەی هەستی پێبکا، بیهێنیت و فەزایەکی زۆریشی بدەیتێ تا کتێبەکە هێدی هێدی دەچۆڕێتە ئەوەوە، لە ڕێگە -شێوەیەکی هونەرگەرایی وادا کە بە ئاکیوپونکتور بچێ- دەبێ دەرزیی ژانشکێن ڕێك لە شوێنی ئازار بدرێت تا تەوژم و گوڕی لە سیستەمی نێرڤدا شەپۆل بدا و دیسانەوە خۆی بژێنێتەوە.
لەو بڕوایەدام، گەر ئەم پەیوەندییە قووڵ و تەواوکارەی نێوان ڕۆماننووس و خوێنەر هاوتایەکی هەبێ، ئەوە دەبێ لە دونیای مۆسیکدا بێ. من هەمیشە بڕوام بەوە بووە، کە نووسین خۆی لە مۆسیك نزیك دەکاتەوە، لێ هێندەی ئەو پاك نییە، بۆ خۆشم هەمیشە ئیرەییم بە موسیزیان بردووە، چونکە، لە چاوی مندا، هونەری وان بریقوباقی بەرزتر دەهاوێ بەسەر هونەری ڕۆماندا، ئەمن ئیرەییم بە شاعیرانیش بردووە، چونکە ئەوان پێگەیان نزیکترە لە مۆسیك بە بەرابەر بە ڕۆماننووسان. ئەمن بە منداڵی دەستم داینێ شیعرنووسین، بۆیە دەکرێ لەو پەیڤە حاڵی بم، کە لە جێیەکدا خوێندوومەتەوە: "لە شاعیرانی خراپەوە پەخشاننووسی چاك پەیدا دەبێ".
باسی مۆسیکمان کرد، ڕۆماننووسێ دەبێ تۆماری تەواوی مەردمگەلێك، جوگرافیا و



شەقامانێ کە ئەو توانیویەتی تێبینیان بکات، لە نۆتەنامەیەکدا تۆمار بکات. جا هەر کە گەیشتەوە هەمان شوێن و جێگا، برێك، بەشگەلێکی میلۆدییەکە سەرلەنوێ سەرهەڵدەداتەوە. لەم کتێبەوە بۆ ئەو کتێب، بەڵام ئەم نۆتەنامەیە بە لای ئەوەوە، نووسەرەوە، لەوە ناچێت لە ڕووی مۆسیکییەوە کامڵ بێت. ئەو خەمی ئەوەیەتی کە مۆسیزیانێکی ڕێکوپێکی تەواوی لێدەرنەچووە و بۆشی ناکرێ نۆکتورێنێر-ێکی شۆپین بنووسێت.

گەر لە دیدی بەرهەمی نووسینیەوە لە کەموکوڕیی توانای ڕۆماننووسێ بڕوانین و داوەری بکەین، ئەم دیدەنیگایە سەروسەودای لەگەڵ دیاردەیەکدا هەیە، کە من بەشبەحاڵی خۆم تێبینیم لای خۆم و هەروەکو لای زۆر نووسەرانی تریش کردووە: هەر جارەی نووسەر کتێبێکی تازە دەنووسێ، کتێبی پێشووتر لە هۆشیدا دیار نامێنێ، تا دەگاتە ئاستێك وای بۆ دەچێت کە ئیتر تەواو لە یادی کردووە. ئەمن وای بۆ دەچووم کتێبەکانی من ناوەڕۆکێکی بەیەکەوەگرێدراویان نییە، چونکە من هەمیشە بە مەزەنەی خۆم کتێبی پێشووترم لە بیر چووەتەوە. بەڵام کەچی دیسانەوە هەمان ڕوخسار دەبینمەوە، هەمان ناو، هەمان شوێن، هەمان ڕستە، ئیدی کتێب لە دوای کتێب. هەروەك نەخشونیگاری "گۆبێلێنگ" ڕووکاری موقەبای ڕازانەوەی دیوار، کە کابرای ڕەنگکێش بە نیمە-خەواڵووەوە خەریکی چنینی بووبێت. نیمە-خەواڵو یان خەوبێداری. ڕۆماننووس لە عەزرەت خەمی نووسین، بەوە دەچێت لە خەودا بڕوات. جا هەر بە ڕاستییش، دەمێ شەقامێ تەی دەکات، هۆکاری نیگەرانیی هەیە نەك ببێ بە ژێر ترۆمبێلێکەوە. بەڵام ئەودەم مرۆڤ ئەو وردەکارییە ئێکستریمە لە بیر دەکا چۆن ئەم خەو-پیادەڕۆیە بەسەر سەربانیدا دەڕوات بێ ئەوەی هەرگیز خەمی کەوتنەخوارەوەی هەبێت.

زۆرتر ئەو فۆرمولەیە، لە ڕوونکردنەوەنامەی هۆکاری خەڵاتی نۆبێڵتان لەبەرچی بە من بەخشی، سەرنجی ڕاکێشام کە زیاتر ئاماژە بە دواجەنگی جیهان دەکات: "هەروەها ڕووماڵی دونیای - ترسی ساڵانی داگیرکردنی کردووە". منیش، هەر وەکو گشت کەسانێکی تر کە لە ساڵی ١٩٤٥دا لەدایك بوون، منداڵی جەنگم، چونکە من لە پاریس لەدایك بووم، منداڵێ کە دەبێ، تا زیاتر ڕوون بێتەوە، بۆ هاتنەدونیاوەی، شوکرانەبێژی پاریس-ی داگیرکراوی بێ. پاریس-ێك دانیشتووانی دەیانویست بە زووترین کات لە بیر خۆیانی بەرنەوە، یاخود تەنێ هەندێ وردەکاریی ڕۆژانەیان دەربارەی بێتەوە یاد، لەو جۆرانەی کە خەیاڵاتێکی وات پێدەبەخشن، گوایێ ژیان نزیکەی وەك ژیانی ئاسایی دەگوزەرا. مۆتەکە -خەوێکی هەراسانکار، ویژدانێکی تەڵخی بەد لەبەر ئەوەی مرۆڤ بەم یان بەو هۆ لە مەرگ قورتار بووبوو- نەمرد و زیندە مایەوە. کاتێ لە باوانی خۆمان دەپرسی دەربارەی ئەو قۆناخ و سەردەمەی پاریس، ئەوان خۆیان لە پرسیارەکە گێل دەکرد. یان ساکیت دەبوون، هەر وەکو ئەوەی بیانەوێ ئەو حەمکە ساڵە غەمگینە لە

یادەوەرییانڕا بسڕنەوە و شتێ لە ئێمە بشارنەوە. بەڵام لەودیو دیواری بیدەنگییانەوە ئێمە مەزەنەی گشت شتێکمان دەکرد، هەروەکو ئەوەی خۆمان تێیدا ژیابین.

پاریسی داگیرکراو شارێکی سەیر بوو. ڕووکەش، زیندەگی بەردەوامیی خۆی هەبوو وەك "لەوەوپێش": شانۆ، سینەما، کاباڕێ و ڕیستۆرانان کرابوونەوە. ستران لە ڕادیۆکانەوە دەهاتنە بەرگوێ. تەنانەت مەردم زیاتر لە پێشوەختی جەنگ دەچوونە دیدەنیی سینەما و شانۆ، هەر وەکو ئەوەی ئەم هۆڵانە گشتیان جێگای داڵدەدان، حەشارگە و ئێکسیل بن، خەڵکی لە نێویاندا کۆ دەبوونەوە تا هەست بە دڵنیایی بکەن. لێ لە هەندێ هەلومەرجی نائاساییدا دەکرا تێبینی بکرێ کە پاریس وەکو سەردەمی پێشووی نییە. لەبەر کەمیی ترۆمبێل و ماشین شارێکی بێدەنگ بوو - سکوتێك کە تێیدا مرۆڤ گوێی لە خشپەی گەڵا، ناڵەی سمی ئەسپ دەبوو، لە بولڤارەکانیشڕا دەنگی هەنگاوی حەشاماتی خەڵك و هاتوهەرایان بەرز دەبووەوە. لە بێدەنگیی شەقامەکانڕا، بە تایبەتی دەمێ تاریکی باڵی دەکێشا وەك کاتی زستان کە تاریکیی کاتژمێری پێنجی دوای نیوەڕۆ دەکەوت، دەمانێ کە ئیدی تۆزقاڵێك ڕۆشنایی چییە، لە پەنجەرەکانەوە نەدەبینران، وا دەهاتە پێشچاو، شار لە خۆی دوور کەوتبێتەوە و بۆ دوور لە خۆی سەفەری کردبێ - شارێك، "بێ نیگا"، وەك نازییە داگیرکارەکان دەیانگوت. دەکرا، گەورە و بچووك لە چاوتروکاندنێکدا، بێ سەروشوێن ون بن. مرۆڤ کە قسانی دەکرد، وشەکانی لە بەرگی نهێنی دەگرتن و بە هیچ کلۆجێ بە دڵولەفزی کراوەوە نەدەهاتنە پەیڤین، تەنانەت لە نێوان دۆست و ئاشنایانیشڕا، چونکە هەڕەشەیەك بەسەر سەرتەوە دەسووڕا.

لەم پاریس-ی چوون کابوسەدا، کە تێیدا ترسی ئەوە لە گۆڕێدا بوو مرۆڤ زمانی لێبدرێ و لە هەڵمەتێکدا بەگیری بکەن، ئیدی دەمێ لە وێستگەی میترۆ دەهاتییە دەرێ، دیدەنی و وێنەی سەرچڵبازی دە نێوان مرۆڤەکانڕا بەدەر دەکەوت، کە هەرگیزاوهەرگیز لە سەردەمی ئاشتیدا ڕوویان نەدەدا. پەیوەندیی دڵداری، لە سایەی قەدەخەکردنی هاتوچۆدا، بە کورتخایەنی لەدایك دەبوو، کەسیش نەیدەتوانی دڵنیا بێ لەوەی جارێکی تر، بۆ ڕۆژی دوای ئەو، یەکتر دەبیننەوە. وەك بەرە-میوەیەکی ئەم جۆرە پەیوەندییانە، زۆربەی کات لە سبەی هەڵبوێراو و هەندێ جاریش سامناك، لەگەڵ کاتدا کەم کەم منداڵ دەهاتنە دونیاوە. هەر لەبەر ئەوەیە کە پاریسی داگیرکراو، بە لای منەوە، شەوی ئافراندنە، کە من لێوەی هاتوومەتە دەر. ئەم پاریسە هەرگیز دەستی هەڵنەگرتووە لەوەی سەردانم بکا و ڕۆمانەکانی من، جارناجار، دە نێو شەوق و ڕەونەقێك کە چارشێوئاسا دەوری پاریس- یان داوە، خەریکی وردە مەلەن.



بەڵێ، ساڵی لەدایکبوون و سەردەمی نووسەرێك، ئاسەوارێك كە قابیلی فەوتان نییە. لەكن نووسەرەكەی بەجێ دێڵێ، تەنانەت گەر ئەو بۆ خۆی چالاكانە و ئەكتیڤیش بەشداری لە پێشهاتە سیاسییەكاندا نەكات. هەتاكونێ ئەگەر خۆیشی وا نیشان بدا گورگی هەڵكردووی تەنیایە و خۆی دزیووەتەوە بۆ ئەو شوێنەی كە مرۆڤ ناوی بورجی عاجی لێناوە. خۆ گەر شیعر بنووسێ، ئەوە سەردەمی نووسەر مۆركی خۆی بە نووسینی ئەوەوە دەنێ و ئیتر ناكرێ بۆ وان لە قۆناخێكی تردا بێنە نووسین.

شیعری "قازە كێوییەكانی لای كوولێ" كە یەتێس، نووسەری گەورەی ئیرلەندی نووسیویەتی، شیعرێكە هەمیشە لە ناخەوە منی هەژاندووە. لە پاركێكدا یەتێس پۆلە قازێ دەبینێ چۆن بەو ئاوەدا دەڕۆن:

پاییزی نۆزدەیەم، دوای ئەوەی بژاردمان، تووشی بەڵای كردم،

ئەودەم -پێش ئەوەی لە ژماردن ببمەوە- بینیم

چۆن هەموو لە پڕ بەرز بوونەوە و

بڵاو بوونەوە، بە شەقەی باڵیانەوە

لە بازنەی شكاودا دەسووڕانەوە

كەچی ئێستا بە ڕووی ئەو ئاوە مەنگەدا سەوڵ لێدەدەن

پڕ نهێنین، پڕ لە جوانین.

چ قامیشەڵانێك دەكەنە بنەوبارگەیان

لە كەناری چ دەریاچەیەك یان گۆمێكدا

بینایی تریان پێ ئەفسوناوی دەبن

كەچی دەمێ بێدار دەبمەوە

ئەوان لە شەقەی باڵیان داوە و

بە ئاسمانی خۆیاندا فڕیون.

زۆربەی كات قاز لە شیعری چەرخی هەژدەدا - لای بودلێر یان مالەرمێ، دەردەكەون. كەچی سەرباری ئەوەش، نەدەكرا شیعرەكەی یەتێس لە چەرخی هەژدەدا نووسرابا. بەو ڕیتمە تایبەت و غەمگینەی خۆیەوە نموونەیەكی سمراوی چەرخی نۆزدە، بەڵێ، تەنانەت ئەو ساڵەیە كە تیایدا نووسراوە. ڕوو دەدات هەندێ جار كە نووسەرێكی

چەرخی بیست هەست دەکا لە سەردەمەکەی خۆیدا بەندە؛ کاتێ نووسەرە گەورەکانی چەرخی نۆزدە دەخوێنێتەوە، کەمێکیش نۆستالّگی دەیگرێت - بەلزاك، دیکنس، تۆلستۆی، دۆستۆیڤسکی. دەورانی قۆناخێك بوو کە کات هێواشتر دەبزوت وەك لە ئەمڕۆ، هێواشییەك کە لەتەك ئیشوکاری ڕۆماننووساندا دەگونجا، چونکە دەورانی زەمەنێك بوو هانی چاوکراوەیی و بیرکۆکردنەوەی دەدا. لەو دەمەوە کات برەوی بە ڕەوتی خۆی داوە و ئێستاکێ شەقار شەقار بۆ پێشەوە خۆی دەکوتێ. ئەمە بۆ خۆی جیاوازیی نێوان سترەکچەری ڕۆمانە گەورەکانی ڕابوردوو، کە هێند گەورەن، بە کلّێسان دەچن، لەگەلّ هونەری ڕۆمانەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆ، کە زیاتر پچڕپچڕ و تیکەتیکەن و یەکێتییەك کۆیان ناکاتەوە، ڕوون دەکاتەوە. لەو ڕوانگەیەوە، ئەمن بۆ خۆم نەوەی میانی نێوەندیانم، بۆ خۆم فزولّیشم بەوەی نەوەکانی داهاتوو، کە لەتەك ئینتەرنێتدا، مۆبایل، ئی-مەیل و تویتەردا گەورە دەبن، چۆن لە ڕووی ئەدەبییەوە دونیایەك وێنا دەکەن تێیدا هەر یەکێك بە بەردەوامی "بە ئۆن لاین وابەستەیە" و "تۆڕە - مێدیا کۆمەلاّیەتییەکان" و سنووری فەزا و پانتایی پەیوەندییە سۆزدار و نهێنگیرەکانمان دەشکێنن، کە تا ماوەیەکی نزیك پێش ئێستا سەرچاوەی توانامان بوون - ئەو نهێنییانەی  قووڵاییان بە مرۆڤان دەبەخشی و دەکرا ببنە مۆتیڤێکی ئەدەبیی گرینگ لایان. بەلاّم من پڕ بە دلّ حەز دەکەم بە گەشبینییەوە لە ئەدەبی ئاییندە بڕوانم، هەر بۆ خۆشم دلّنیام کە نووسەرانی نەوەی نوێ کات بە خۆیان دەدەن، کتومت هەروەکو نووسەرانێ لە ڕۆژگاری هۆمێرۆس—ەوە، پەیڕەویان کردووە...

دەشێ نووسەر، وەك هەر هونەرمەندێکی تر، بە قۆناخی سەردەمەکەی خۆیەوە زنجیر کرابێ، بەبێ هیچ دەرفەتگەلێ کە بتوانێ لێی دەرباز بێ یان هەوایەکی تر هەلّمژێ بێجگە لە هەوای ڕۆحی سەردەم، وێڕای ئەوەش هەمیشە نووسەر وێنای شتێکی بێ-کات دەکات. لە بیناسازکردنی دراماکانی ڕاسینێ و شەکسپێر شتێکی سەرەکی و جەوهەری نییە گەر بێتوو پۆشاك و قاتەکان وەك ڕۆژگاری ئانتیك بڕابن، یاخود دەرهێنەر کاوبۆ و کۆتی چەرم لەبەر ئەکتەری ڕۆلّەکانی بکات. ئەمانە وردەکاریگەلێکن، کە گوزارشت و مانایان نییە. کە مرۆڤ "ئانا کارێنینا"ی تۆلّستۆی دەخوێنێتەوە، هێند لێمان نزیك دەبێتەوە، ئیدی مرۆڤ لە بیری دەکا کە خانم خۆی لە کراسی ئاودامانی سالّی ١٨٧٠ پێچاوە، هەرچەندە سەدە و قوسورێك بەسەر ڕۆمانەکەدا گوزەری کردووە. هەندێ لە نووسەرانیش، لەوانە ئادگار ئالان پۆ، مێلێڤیل و ستێندالّ، دووسەد سالّ دوای لەدایکبوونیان بەرزتر دەنرخێندرێن، وەك لە نووسەرانی سەردەمی خۆیان.

باشە، ڕۆماننووسێك، ڕێك بە وردی، لە چ مەسافەیەکدا وێستاوە؟ یەك کەم لەولای ژیانەوە، تا بتوانێت وەسفی بکات. لێ گەر زیاتر ڕاکێشرابێتە نێو ژیانەوە - مرۆڤ - کردە



بێ - ژیان بە ڕوونی نابینێت. ئەم مەسافە بچکۆلەیە ڕێگر نابێ لەوەی تا هەست بە ناخی پاڵەوانە وێناکراوەکانی و ئایدیایەکانی ئەوان بکات، هەر وەکو ئەوەی لە ژیانی ڕاستیدا دەیکات. فلۆبێرت گوتویەتی: "ئەوە منم کە مادام بۆڤارییە". تۆڵستۆییش خێرا خۆی بە خانمێك چوواند، کە شەوێك بە پێشچاویەوە بینی خۆی هەڵدایە بەردەم قەتارێ، لە وێستگەیەکی ڕووسیی قەتاراندا. توانای هەستپێکردنی کەسان و دەوروبەری لای تۆلستۆی هێند زۆر و بەهێز بوو، کە لەگەڵ ئاسمان و دەوروبەری جوگرافیدا، کاتێ وەسفی دەکردن، دەبوونە یەك. ئەو لەگەڵ گشت شتێکدا دەژیا، تا کەمترین لەرزە و جووڵانی پێڵوی ئانا کارنێنا. ئەم حاڵەتی وەجدئاسایە ئۆپۆزیتی نارسیسیسمە "خۆپەرستییە"، چونکە ڕۆماننووس وای بۆ دەچێت هەم خودی خۆی لە بیر بکات و هەم تا هێزی تێدایە، مێشکی کۆ بکاتەوە، تا هەستی بۆ گشت وردەکارییەك ئاوەڵا و کراوە بێت. ئەمەش بۆ خۆی مەرجدارە بە جۆرێك لە جۆرەکانی تەنیاییەوە. نەك بەوەی خۆی دوورەپەرێز بگرێ، بەڵکو توانای تێبینیگری و ڕۆشنیی لە بینیندا دەچێتە لوتکە، تا بتوانێ دونیای دەرەوە بگوێزێتەوە بۆ دووتوێی ڕۆمانێك.
من هەمیشە لەو بڕوایەدا بووم کە دەکرێ بۆ شاعیران و ڕۆماننووسان مرۆڤی ئاسایی و عادی، شتی پڕوپوچ و ڕووکەشدار، ئەفسوناوی بکەن! ئەویش بە کورتی لە ڕێی تێبینیکردنی ئەمانە بە سەرنجێك، کە قەت تووشی دەردی سستی و بێهێزی نەبێ و بە نیگایەکی هیپنۆتیسئاسا "خەولێخستنی موگناتیسی" بڕوانێ. نووسەر وا لە ڕۆژانی ئاسایی دەکات ببێتە میستێریۆم "پەنهانە-ڕاز"، نووسەر فریووی ڕۆژێکی ئاسایی وەك هەموو ڕۆژەکانی دەدا تا ئەو شەوقە پەنهانەی لە قووڵاییدا حەشاری داوە، لە یەکەم ڕوانینماندا لێمان پەنهانە و دیار نییە، لە حەشارگەی ناخی ڕۆژە ئاساییەکاندا، فرێت داتە دەرێ. ئەمە فرمان و ڕۆڵی شاعیران و ڕۆماننووسانن، تەنانەت هونەرمەندە نیگارکێشەکانیشن: مەتەڵی نهێنییە پەنهانەکان و ڕووناکیی قەراری ناخ لای هەر یەکێك لە مرۆڤان دەربخەن. ئەمن بیر لەو خزمە دوورە نیگارکێشەم، ئامێدۆ مۆدیگیلیانی، دەکەمەوە. ئەو تابلۆیانەی ئەو کە زیاتر مرۆڤ دەهەژێنن، ئەوانەن کە کەسانی نائاشنا بە مۆدێل بۆی وەستاون، منداڵان و سۆزانیانی شەقام، خزمەتچیان و وەرزێرانی هەژار، شاگردانی مێردمنداڵ. ئەو وێنانەی بە هێڵی درێژی واکێشاوە، کە بیرمان دەباتەوە بۆ نەریتی تۆسکانە گەورەکان، بۆ کن بۆتیسێللی و قوتابخانەی - سیێنا لە چەرخی چواردەدا.
ئەو جوانی و قەشەنگییەکی تەواوی وایان پێدەبەخشێ -یان ڕاستر لا دەردەخا- کە لەژێر ڕووکەشی بێگوزارشت و ئاساییئاسای دەرەوەی ئەواندایە.
ڕۆماننووسان دەبێ بە هەمان ئاڕاستە کار بکەن. نووسەر بە فانتازیای خۆی نابێت واقیع بشێوێنێت، بگرە بە

پێچەوانەوە، دەبێ خۆی دابخزێنێتە قەراری قووڵایی واقیعەوە، بە هێزی تیشکی ئوڵتراسوور و ئوڵتراوەنەوشەیی ئەوەی لەژێر ڕووبەریدا خۆی حەشار داوە، ڕووتوقووتی بکاتەوە تا واقیع بە چاوی خۆی لە خۆی بڕوانێت. ئەمن ئەو بۆچوونە بە لامەوە نامۆ نییە، کە لە باشترین حاڵەتدا، ڕۆماننووس جۆرێك بە پەیامبەر دەچووێنێ، بەڵێ، مژدەهێنەر. هەروەها تەنانەت سێیسمۆگراف بێ، ئامادە بێ بۆ تۆمارکردنی نزمترین جووڵە و بزووتنەوەی هەستپێنەکراو.

من هەمیشە، بەر لەوەی دەست بکەم بە خوێندنەوەی بیۆگرافیای "ژیاننامە" نووسەرێ، کە بە دڵم بووە، دوودڵ بووم. بیوگرافنووسان زۆربەی جار لە وردەکاریدا گیری دەکەن و دەچەقن، گەواهی و شایەتی گوماناوی، خەسڵەت و ئاکاری ناجۆر و سەیروسەمەرە، بەوە دەچێ هەوڵ بدەیت گوێ بۆ پەخشی ڕادیۆیەك ڕادێریت، کە لەبەر خشەخش گوێت لە موسیك یان سەداکەی نەبێت. تەنێ لە ڕێی خوێندنەوەی کتێبانی نووسەر خۆیەوە دەکرێ ئێمە ئاشنای بین، تەنێ لەوێندەرێدا هەقیقەتی خۆی دەردەخا و بە نەرمی لەگەڵمان دەپەیڤێت بەبێ هیچ خشەخشێك.

بەڵام کاتێ مرۆڤ بیۆگرافیای نووسەرێك دەخوێنێتەوە، دەبینێ ڕووداوێکی گرینگ لە منداڵیدا مۆرکی خۆی لە منداڵەکە داوە و بووەتە جۆرێ لە قاڵب و کلێشە بۆ ئەو بەرهەمەی دوای پێشهاتەکە، ڕووداوێك لە فۆرم و شێوەی جیاوازدا، لە کتێبەکانیدا دەردەکەونەوە، بەبێ ئەوەی لەو ڕووەوە خۆی هەمیشە هۆشی لای ئەو بەسەرهاتە بووبێ.

من بیر لە ئالفرێد هیتشکۆك دەکەمەوە، کە ڕاستە نووسەر نەبوو، لێ فیلمەکانی هەمان هێزوگوڕ و یەکێتیبوونێکیان تێدایە، کە بە بەرهەمی ئەدەبیی سەرجەمی ژیانی نووسەرێك دەچێت.

کاتێ هیتشکۆك پێنج ساڵان دەبێت، باوکی دەینێرێت بۆ لای دۆستێکی خۆشەویستی، کە کۆمیساری پۆلیسە، تا نامەیەکی بداتێ. دوای ئەوەی نامەکە دەگەیێنێتە دەستی، کۆمیسار منداڵ دەنێتە نێو گرتووخانەوە و دەرگای لەسەر قایم دەکا، ئەو ڕۆژەش هەرچی تاوانبارێ هەیە، کە شەو بە تۆمەتی جۆراوجۆر گیراون، لەوێ دەستبەسەرن. منداڵی زراوچوو سەعاتێکی تەواو چاوەڕێی کۆمیسارەکە دەکا تا لە دواییدا دەرگای لێدەکاتەوە و پێی دەڵێت: "ئێستا دەزانیت چی چاوەڕێت دەکا گەر هاتوو ڕەفتارێکی خراپ لە ژیانتدا بنوێنیت".

ئەم پۆلیسکۆمیسارە، بەم شێوە پەروەردە نائاساییەی خۆیەوە، دەشێ سەرچاوەی ئەو نیگەرانی و دڵەڕاوکێیە بێ، کە لە تەواوی فیلمەکانی هیتیشکۆکدا ڕەنگی داوەتەوە.

من نامەوێت بە باسەکانی خۆم جاڕستان بکەم، بەڵام لەو بڕوایەدام هەندێ دیرۆك و چیرۆکی سەردەمی منداڵیم بە قاڵب و کلێشەی کتێبەکانم دەچن. من زۆربەی کات دوور لە باوانی خۆم دەمگوزەراند، لای دۆست و ئاشنایانێ، کە منیان پێدەسپاردن و منیش



بۆ خۆم هیچم دەربارەیان نەدەزانی، لە شوێنانی جیاواز و لە فرەگەلێ خانووی جیاوازدا. منداڵ هیچ شتێك بە لایەوە عەجیب و عەنتیکە نییە؛ بەڵکە ئەو تەواوی ئەو هەموو هەلومەرجە سەیروسەمەرانە بە سروشتی تێدەگا. من بەش بە حاڵی خۆم درەنگ پێم زانی کە چۆن منداڵیم پڕ بووە لە نهێنیی پەنهانی ناوازە.

هەوڵم دا زیاتر شارەزای ئەو مرۆڤانە بم، کە باوانم منیان بە ئەمانەت بەوان دەسپارد و زیاتر لە وێستگەی جیاوازیی نشینخانەکانم بزانم. بەڵام سەرکەوتوو نەبووم لە ناسینەوەی فرەگەلێك لەو کەسانە، هەروەها نەشمتوانی، بە وردبینیی تۆپۆگرافییەوە، ئەو دەڤەر و خانووانە بدۆزمەوە، کە لە ڕابوردوومدا هەن. ئیرادەی دۆزینەوەی ئەم مەتەڵانە و ڕوانین لە نهێنییە پەنهانەکان عەزمی نووسینیان دامێ، وەك ئەوەی نووسین و فەنتازی بتوانن یارمەتیکارم بن تا لە کۆتاییدا وەڵامی ئەم پرسیارانە بدۆزمەوە.

بە بۆنەی ناوهێنانی "میستێری، نهێنییە پەنهان"ەوە، یادی ناونیشانی ڕۆمانێکی چەرخی هەژدەی فەڕەنسیم وە بیر دێنێتەوە: "نهێنییە پەنهانەکانی پاریس". باس باسی شارێکی مەزنە، لەم حاڵەتەدا پاریس، زێدی من، کە یەکەم جار ئاسەواری لەسەر منداڵیی من هەبوو، بە هێڵی کاریگەریی وا بەهێزەوە، کە ئیدی دوای ئەو من هەرگیز دەستبەرداری گەڕان و پشکنینی دۆزینەوەی "نهێنییە پەنهانەکان"ی پاریس نەبووم. لە تەمەنی نۆ ساڵیمدا بوو، هەڵکەوت لەو ناوەدا بە تەنێ دەگەڕام، هەرچەندە دەشترسام کە ڕێ بزر بکەم، بەڵام تا دەهات دوور و دوورتر دەکەوتمەوە. بۆ گەڕەکانێ بە من نائاشنا لای کەناری ڕاستی ڕووباری سێینێس. گەرمەی ڕۆژی نیوەڕۆ بوو، هەر بۆیێ کەم یان زۆر هەستم بە دڵنیایی دەکرد. لە سەرەتای مێردمنداڵیمدا هەوڵم دا بەسەر ترسمدا زاڵ بم، لە ڕێی ئەوەی بە شەوان وەدەرکەوم و سواری مێترۆ بم تا زیاتر بچمە لایەنە فرە دوورترەکانی شار. بەو شێوەیە مرۆڤ ئاشنایی لەتەك شاردا پەیدا دەکا، لەو ڕووەوە منیش بە دەستوری فرەگەلێ لە ڕۆماننووسانێ کە من پێیان سەرسامبووم، کردم و لە بەرهەمانی شاری گەورەیانڕا -جا بە هەچ ناونیشانێ نێوزەد کرابێ، پاریس، لەندەن، سانکت پێتێرسبۆرگ یان ستۆکهۆڵم- کە ئیدی لە دوای چەرخی هەژدەهەمەوە بوونەتە شوێن گەمە و بابەت و پێکهێنانی تێمای گرینگ.

ئادگار ئاڵان پۆ ڕێچکەی زەمینێکی نوێ دەشکێنێ، دەمێك لە نۆڤێلی "پیاوێك دە نێو ئاپۆرەکەیڕا" وەسفی شەپۆلی مرۆڤان دەکا، کە ئەو بۆ خۆی لە پەنجەرەی کافێتێریایەکەوە دەیانبینێ و چۆن دەڕژێنە سەر شۆستەکان. ئەو چاوی بە پیرەمێردێکی سەیر و عەجیب دەکەوێت، حەز دەکا زیاتر ئاشنای بێت. جا بۆیێ شەوانە لە گەڕەکی جیاواز جیاوازی لەندەندا وەدووی دەکەوێت. بەڵام ئەو نائاشنایە، وەدووکەوتنی ئەم بۆ "پیاوێك دە نێو ئاپۆرەکەیڕا" بێسەمەرە. ئەو هەمیشە و تا دونیا دونیایە، دەبێتە نائاشنایەك و مرۆڤیش بە هیچ جۆرێ بۆی ناکرێ شتێ لەمەڕ ئەو هەڵبکرێنێ.

ئەو وەك كەسێكی تەنێ و شەخسێك وجودی نییە، تەنێ وەك بەشێك، پارچەیەكی دانەبڕاو لە ئاپۆرەی خەڵكەكەیە، كە ڕاگوزەر بە لاتدا دێ و لە پێشەنگی چڕوپڕی خەڵكدایە، جا بەر ئانیشك و قۆڵان دەكەوێت، دەیخەن و ئیتر لە شەقاماندا خۆی لێ بزر دەبێ.

ئەمن بیر لە پێشهاتێكی تریش دەكەمەوە، كە بەسەر شاعیر تۆماس دێ كوینسێ - لە تافی نەوجەوانیدا هاتووە و تا هەتایە لە ئایندەی ئەودا ڕەنگی داوەتەوە. لە لەندەن، لەسەر شەقامی ئۆكسفۆرد، كیژێكی تازەهەڵچوو دە نێو ئاپۆرەی خەڵكدا دەبینێت، جۆرێك لە ئاشنایەتی كە بە ڕێكەوت لە شارانی گەورەدا هەڵدەكەون. ئەوان پێكەوە چەند ڕۆژێك بەسەر دەبەن پێش ئەوەی ئەو خۆی بۆ ماوەیەك پێویست بكا، لە لەندەن ئۆغر دەكات. هەردووكیان ڕێك دەكەون، كە خانم دوای ئەوەی هەفتەیەك دەگوزەرێت، هەموو لای ئێوارەیەك، لە هەمان كاتی دیاریكراودا، لەسەر سیلەی شەقامی تیچفایڵد لە چاوەڕوانیی ئەودا بێت. بەڵام ئەوان هەرگیز جارێكی تر بە یەكتر شاد نابنەوە. "من دڵنیا'م' لەوەی ئێمە بە شوێن یەكتردا دەگەڕاین، زۆربەی جار لە هەمان ساتەوەختدا، لە وێندەرێ دە نێو كوچە و كەلەبەری لەندەندا، هەندێ جار دەشێ چەند مەترێ لە یەكترەوە دوور بووبین - لێ ئەویش بۆ خۆی لەسەر شەقامێكی لەندەن مەسافەیەكی كافییە تا دوو مرۆڤ، تا دونیا دونیایە، لەیەك هەڵبڕێن!"

لە شارێكرا كە زێدی مرۆڤێ بێ و ساڵانێكی زۆر تێیدا زیندەگیی كردبێت، هەموو تاقە گەڕەكێك بۆ خۆی، هەموو شەقامێك، خەم و جەخارێ، ساتەوەختێكی شاد وە بیرت دێننەوە. یەك شەقام، خودی ئەو تاقە شەقامە بۆ خۆی زۆربەی جار وابەستە بە چەندەها توێژ و چینی یادەوەرییەوە، بە جۆرێك كە دەبێ مرۆڤ شوكرانەبژێری تۆپۆگرافیی شارەكە بێ، چونكە بۆی دەكرێ لە ڕێیەوە تەواوی ژیانی وە بیر بێتەوە، چین لە دوای چین وەك ئەوەی مرۆڤ بیەوێ هەوڵی خوێندنەوەی مەتنی یەكەمی كەشكۆڵێكی دەستنووسی پاڵیمپسێست بدات. ژیانی خەڵكانی تریش، ئەو هەموو هەزارەها مرۆڤەی ڕۆژانە لەسەر شەقام، دە نێو مێترۆ لە گەرمیی ڕێچكەی ئاپۆرەی حەشاماتێ كاتی پێش - دوای دەوام تووشت دەبێ.




كە تازە لاو بووم و لە سەروسەودای دەستپێكی نووسیندا بووم، بە شوێن كەتەلۆگی دێرینی تەلەفونی دەڤەری پاریسدا دەگەڕام، بەتایبەتی لەو جۆرانەی كە بەشداربووانی تەنێ بە ئەدرەسی شەقامەكانیانەوە تۆماربەند كراون. هەڵدانەوەی لاپەڕەی كەتەلۆگێكی لەو جۆرە بەوە دەچێت لە ئەشیعەیەكی شارەكە بڕوانیت. شارێكی داخزاو، ئاتڵەنتی، بۆنوبەرامی سەردەم و ڕۆژگاری بەرەو ڕووت دەهات. تەنێ ئاسەوارێ كە بە هەزارەها

مرۆڤی نائاشنا بەجێیان هێشتبن: ناو، ژمارەی خانوو لەگەڵ ژمارەی تەلەفۆنەکانیان بوو. هەندێ جار ناوێك لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر نەمابوو. ڕوانین لەم کەتەلۆگە کەونانە و زانین بەوەی ئیتر چیدی کەسێ وەڵامی ئەو ژمارەیە ناداتەوە، هەستێکی دەدا بە مرۆڤ، کە تووشی سەرەگێژەیەکی وای دەکردی، ئەگەر بوو بیخات بە عەردا.

ماوەیەك دوای ئەوە چەند دێڕێك لە شیعرێکی ئۆسیپ ماندڵستام لە کەللەی دام:

گەڕانەوە بۆ شارەکەم، ئاشنا هەتا بە ئەشك

هەتا بە دەمارەکانم،

هەتا بە گلاندی هەوکردووی منداڵی گیانم

{..........}

پێتێرسبورگ !{......}

تۆ دەبێ ژمارەی تەلەفونەکانی منت مابێ؟

پێتێرسبورگ! هەنووك چەند ئادرەسێکم لایە

سەدای مردووەکان یەك بە یەکی دەبینمەوە، تیایا!

بەڵێ، وابزانم دەمێ من لاپەڕەکانی ئەو تەلەفۆنکەتەلۆگانەم هەڵدەدایەوە، ئارەزووی نووسینی کتێبەکانی سەرەتام گرتمی.

مرۆڤ تەنێ پێویستی بەوەیە بەشداربوویەك دە نێو سەدهەزار بەشداربووانی تردا هەڵبژێرێ، هێڵێك بە ژێر: ناوی، ئادرەس و ژمارەی تەلەفونی ئەو کەسەدا، بە قەڵەمێکی ڕەساس، بێنێت، بیهێنێتە بەرچاوی خۆی، ژیانی ئەو نا-ئاشنایە داخۆ چۆن گوزەرابێت. دەکرێ مرۆڤ لە شارێکی گەورەدا ڕێ ون بکا و دیار نەمێنێ. دەکرێ مرۆڤ، ڕێکوپێك هەر بە ڕاستی، ناسنامەی خۆی بگۆڕێت و ژیانێکی تازە بۆ خۆی پێك بهێنێت. دەکرێ شوێنپێهەڵگرتنی کەسێ بە تەنیا وەختێکی زۆری بووێ گەر مرۆڤ تەنیا جووتێ ئادرەسی شەقامی لە بەشێکی چەپەر و تەریووی شارێکی لابێ بۆ سۆراخکردنی ئەو کەسە. ئەو ئاماژە کورتانەی لە هەندێ زانیارینامەدا دەدرێن، هەمیشە سەدایەکیان دروست کردووە، کە دەنگ دەدەنەوە لام: "دوا ئادرەسی زانراو"ی تێمایەك، کە وابەستی فەوتان و لەبیرچوونەوەن. ناسنامە و ڕەوتی زەمەن بە تۆپۆگرافیی شارانی گەورەوە وابەستەیەکی قووڵ و نزیکیان هەیە. بۆیێ هەر لە سەرەتای چەرخی هەژدەوە گەلێك لە ڕۆماننووسان شارانی گەورەیان کردووە بە پێگەی خۆیان، دە نێو ئەواندا، هەندێ لە گەورە

نووسەرانیان، بە شارێکەوە بەستراون؛ بەلزاك لەگەڵ پاریسدا، دیکنس لەتەك لەندەندا، دۆستۆیڤسکی بە سانت پێتێرسبورگەوە، تۆکیۆ بە ناگای کافو، ستۆکهۆڵم بە یاڵمار سوێدەربێرییەوە.
من بەرەی نەوەیەکم، کە لەژێر کاریگەریی ئەم کۆمەڵە نووسەرانەدایە و ئەوانیش بۆ خۆیان، بە دەوریان، ئارەزوویان کردووە بەدواچوون بۆ شتگەلێ بکەن، کە بۆدلێر نێوزەدی کردووە بە "چرچولۆچیی کۆنە گەورەشاران". لە ماوەی ئەم پەنجا ساڵەدا کە گوزەشتووە، دوای ئەوەی من و هاوتەمەنەکانم بە عەقڵێکی کراوەوە شارەکانی خۆمان دۆزییەوە، ئەم شارانە بە دڵنیاییەوە گۆڕاون، لە ئامریکا و لە وڵاتگەلێکدا کە ڕۆژگاری کۆن پێیان دەگوتن جیهانی سێیەم، شارانی ئەم وڵاتانە ئاڵوگۆڕی وایان بەسەردا هاتووە، کە بوونەتە مێگاشار و "شاری - ملوێن - نشینان" تا ئەندازەیەك شوێن نیگەرانین. زۆربەی کات دانیشتوانی ئەم جۆرە شارانە لە ناوچە و گەڕەکی خەڵکجوداکار و هەژارنشیندا بە جیاوازیی کۆمەڵایەتیی قورسەوە زیندەگی دەگوزەرێنن. کوخشاران "کۆکشاران" زیاتر و زیاتر پەل بەملاوئەولادا دەهاوێژن. ڕۆماننووسەکان هەتا چەرخی نۆزدەش کەمە دیدێکی "ڕۆمانسی"یانەیان هەبوو لەمەڕ شار، بە ڕوانگەی دیکنس و بۆدلێر جیاواز نا. شتێکی گرینگە گەر بزانرێت چۆن نووسەران لە پاشەڕۆژدا دێن و وێنای ئەم دەڤەرە چروپرە مەزنانە لە فیکشندا، فەنتازیادا، دەکەن.
ئێوە، دەربارەی نووسینی من، بە نیەتی پاکەوە وشەگەلێك بەکار دێنن "لە پێناوی هونەری جۆرێك لە بیرەوەری، کە ئەو لە ڕێیەوە زیندەگی بە بەری نا-حاڵیبوونترین چارەنووسدا کردووە". ئەمە پێهەڵدانێکە کە زۆر بەرزتر بەسەر شەخسی خۆمدا سەردەکا. ئەو شێوە تایبەتییە بۆ وەبیرهاتنەوە، دەمێك مرۆڤ سۆراخی هەندێ بەشی تاوانە لە ڕابوردوودا و ئەو ئاسەوارە دەگمەنانەی کە نائاشنان، نادیارن کە مرۆڤگەلێکی نەناسراو لەسەر زەمین بە جێیان هێشتووە، ساڵی لەدایکبوونی منیش یەکێکە لەوانە: ١٩٤٥. ئێمە لە ١٩٤٥دا لەدایك بووین، فاکتەیە، دوای ئەم مێژووە، شاران کاول بوون و دانیشتوانیان تەفروتونا بوون، دەشێ ئەمە من و هاونەوەکانمانی بەتایبەتی هەستیار کردبێ لە هەمبەر بابەتگەلی یادەوەری و لەبیرچوون.
بە داخەوە، لەوە بڕوایەدام مەحاڵە سۆراخی ئەو کات و ڕۆژگارانە بە هەمان هێزوگوڕ و ڕۆشناییەك کە لای مارسێل پرۆست هەبوو، بکەین. یادەوەرییەکان لای پرۆست، تەواوی ڕابورد و لە گچکەترین وردەکاریدا زیندە - دەنوێنن، وەك "تابلۆی زیندە". وا هەست دەکەم کە یادەوەریی ئێستاکێ زۆر کەمتر لە خودی خۆی دڵنیایە و دەبێت بەردەوام تێبکۆشێت دژی لەبیرچوونەوە و نەخۆشیی ئەمنێسی "دەردی لەبیرچوونەوە". لەژێر



ئەم چین و توێژانەدا، ئەم هەموو لەبیرچوونەوەیەدا، کە هەموو شوێنێکی داپۆشیووە، تەنێ دەکرێ کەم کەم وردەشکاویی ڕابوردو کۆ بکەینەوە، ئاسەوارگەلێ کە لە پڕ کۆتاییان دێت، بزێون، نزیك وەك چارەنووسی مرۆڤن بێ ئەوەی بکرێ لێیان تێبگەین.
بەڵام ڕەنگە ئەوە بانگی ڕۆماننووسانیش بێت، کە لەسەر ڕووبەری کاغەزی گەورەی سپی خورشیدی ژیان دەکەنەوە بە بەری وشەگەلێکدا، کە نیمچە مردوون - کێوی سەهۆڵ بەربووەتەوە و بە ڕووی دەریادا پەرشو بڵاوبووەوە.

**پاتریك مۆدیانۆ**

**ستۆکهۆڵم/سوید، ئاهەنگی نۆبێڵ**

**پەراوێزەکانی وەرگێڕی کوردی**

بەرواری ٢٠١٤/١٢/٧ ڕۆژنامەی "د.ن"ی سویدی و لۆمۆندی فەڕەنسی، بە هەمان بەروار، پەخشی ڕاستەخۆ لە تەلەفزیۆنی ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەڕەنسییەوە لەگەڵ پەخشی نووسین لە هەردوو ڕۆژنامەی ناوبراودا. سوود لە هەردوو سەرچاوەکە وەرگیراوە.
فریسکۆ: وێنەکێشانی فریسکۆ: خودی فریسکۆ وشەیەکی ئیتالییە، بە مانای تازە، فرێش دێت، جۆرێکە لە وێنەی دیوار کە تۆزمـــڕەنگ تێکەڵ بە ئاو دەکرێ و ڕاستەوخۆ بە ڕووکاری دیواری گەچی، جبسی تەڕ و شێداردا دەدرێ! بەم تەکنیکە دەگوترێت: فریسکۆ، فرێش، تازە، پێچەوانەکەی وێنا و ڕەنگکردنی دیواری وشکە. تەکنیکێکی گرانە و دەبێت نەهێڵرێت تەڕایی ویشك بێتەوە.
ئاکیوپونکتور: ژانشکاندنی بەدەن/ڕۆح لە ڕێی دەرزیی چینییەوە، تەکنیکێکی تیمارگەرایی نەریتئامێزی چینە بۆ ڕەواندنەوەی ئازار و ژان.
نۆکتورەنێر "تایبەت بە شۆپانی مۆسیزیان": پارچە مۆسیکی کورتی پیانۆیە، فرێدریك شۆپین ناوبانگی پێ دەرکردووە.
گۆبڵێنگ: وابەستە بە ناوی خانەوادەی فەڕەنسی - پاریسی خومساز "گۆبلینسس". تەکنیکێکە کە لە بەن و دەزوو کاغەزی دیواری ڕەنگداری ڕازاوە بە وێنە ساز دەکەن بۆ جوانکاریی ڕووی دیواری ماڵان، ساڵۆن و...هتد.
سێتیمۆگراف: ئامێری پێوانی جووڵان و بزێویی زەمین: بوومەلەرزە و...هتد.
پاڵیمپسێست: پاشماوەی کەشکۆڵی چەرم، کە تێیدا نووسینی یەکەم کوژاوەتەوە بەوەی نووسینێکی تری بەسەردا تۆمار کراوە. ئەودەم خوێندنەوەی یەکەم سەختە و شارەزای کەشکۆڵی پێستی گەرەکە.

# نهێنیی هونەری نووسین لای
# پاتریك مۆندیانۆ

میران ئابراهام

پاتریك مۆندیانۆ، ساڵی **1968** بە یەکەم کتێبی، "جێگای ئەستێرە"، لە فەرەنسا و لە ماوەی چوار تا پێنج ساڵدا لە چەندین وڵاتی ئەوروپاشدا ناوی پەیدا کرد، وەکو نووسەری نۆڤێلست ناسرا، ئەوکات نووسەر لە تەمەنی **23** ساڵیدا بوو، بەرهەمی یەکەمی مۆندیانۆ دوای پێنج ساڵ وەرگێڕدرایە سەر زمانی هۆڵەندی. لە دوای ساڵی **1973**وە تاکو ئەمڕۆ **20** بەرهەمی نووسەر لە لایەن سێ چاپخانەوە کراون بە هۆڵەندی، تاکو دوایین بەرهەمی "قاوەخانەی ونبوونی مناڵی" ساڵی **2008**.

پاتریك مۆندیانۆ، لە ساڵی **1968**وە تاکو ئەمڕۆ زیاتر لە سی ڕۆمانی نووسیووە، پێش ئەمساڵ و ئیستاش کە نووسەر خەڵاتی نۆبڵی لە بواری ئەدەبدا پێبڕاوە، سەرنج و ڕەخنەکان لە مۆندیانۆ گۆڕانکارییان بەسەردا نەهاتووە.

دەتوانین سەرجەم ڕەخنە و سەرنجەکان لەم دوو دێڕەدا کورت بکەینەوە: "ڕۆمانەکانی هاوشێوەی یەکن، بێجگە لەوەی کە ناونیشان و کەمێك جار جادە و کوچە و کۆڵانەکان لە گەڕەکێکەوە بۆ گەڕەکێکی تری پاریس دەگۆڕێت... جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە". ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە نووسەر لە چەند ڕۆمانێکیدا باس لە هەمان کات و شوێن دەکات و ڕووداوەکانی هاوشیوەی یەکن.

نووسەرێکی هۆڵەندی "فرانك نۆییەر" لە گۆڤاری نووسیندا، کە خۆی سەرنووسەریەتی، دەڵێت: 'بەختێکی گەورەیە بۆ مۆندیانۆ، کاتی ئەوە هاتووە کە جیهان سەرسام بێت پێی، چونکە بەرزترین خەڵاتی ئەدەبیی پێبڕاوە.'

لە مانگی ڕابردوودا لە سەرانسەری جیهاندا، بەتایبەتی لە ئەوروپادا، هەمان پرسیار لە لایەن نووسەران و ڕەخنەگرانی ئەدەبەوە کراوە، ئەوە بۆ جاری یەکەمە براوەی خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەب بەو شیوەیە پێشوازیی لێبکرێت. لە زۆرینەی سەرنج و نووسینەکاندا ئەم دوو پرسیارە کراون: 'چ هونەرێکی تێدایە بۆ نووسەر پاتریك مۆندیانۆ کە هەموو کتێبێکی نوێی کۆپیی ئەوی پێشتری بێت؟ چۆن دەبێت ئەو جۆرە ئەدەبە خەڵاتی نۆبڵی پێببڕێت؟'

پێدەچێت ئێمەی خوێنەر بتوانین بە یەك ڕۆژ دوو کتێبی نووسەرێك... مەبەست تەنها لێرەدا بەرهەمی ئەو نووسەرانەیە، کە لە سەد ساڵی ڕابردوودا خەڵاتی نۆبڵیان پێبڕاوە، بخوێنینەوە، بەڵام پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە، کە لێپرسراوی ڕاگەیاندنی خەڵاتی نۆبڵ، لە کاتی ئاشکراکردنی براوەی ئەمساڵ پاتریك مۆندیانۆدا دەڵێت: 'نووسەر بۆ هەمووان زۆر ئاسانە بۆ خوێندنەوە، کتێبێکی دوانیوەڕۆ بخوێنەرەوە، پاش ناوبڕێك و خواردنی نانی ئێوارە، دوای نانخواردن دەست بکە بە خوێندنەوەی کتێبێکی تری'.

کریستیان ڤایتس: نووسەر و ڕەخنەگر لە گۆڤاری "ئەمستردامی سەوز"دا، لەسەر ئەم لێدوانە و نووسەر مۆندیانۆ نووسیوویەتی: 'پێش نانخوارن ڕۆمانێك و دوای نانخواردن ڕۆمانێکی تری، تەنها بۆ کاتبەسەربردن، یان... بێئەوەی ڕۆمانی یەکەم کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر خەیاڵمان هەبووبێت، یان ڕەنگێك، ئاسەواری ساردییەك، گەرمییەك، نەرمییەك، یان ئاڵۆزییەك... لەسەر خەیاڵمان جێ بهێڵێت، دوای نانخواردن دەست دەکەین بە خوێندنەوەی ڕۆمانی دووەم.

مۆندیانۆ لە یەکێك لە لێدوانەکانیدا دەڵێت: "ڕۆژانە یەك کاتژمێر دەنووسم، زیاتر سەرقاڵم بە کاری ترەوە، بەڵام بەردەوام خەیاڵم لای نووسینە، چی ڕوو دەدات، یان بیرۆکەی ڕۆمانێکی نوێ، هێڵی سەرەکی، دەربارەی چی بێت؟ ئا ئا... ڕۆمانێکی نوێ." مۆندیانۆ لەو لێدوانەیدا دوای تاوێك بێدەنگی و بیرکردنەوەی، بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "ئەبێت دەربارەی چی بێت؟ لەوانەیە... با بیر بکەمەوە... پیاوێکی گەڕۆکی ونبوو پیاسە دەکات بەسەر شەقامەکانی... ئەبێت

ئەم جارەیان چۆن بێت؟... پاریس! لە کاتی گەڕانەکانیدا بیر لە چەند کەسانێك دەکاتەوە، کە سی تا چل ساڵێك پێش ئێستا، لە قاوەخانەیەکی چەپکەوتوو و تاریکدا یەك دەبینن، بە یادەوەرییەکانیاندا دەچنەوە... ئەو یادەوەرییانە تاریك و ڕوون و خێرا تێدەپەڕن، بەسەر دەفتەرێکی یادگاریدا دەکەون... ڕۆژژمێرێکی کۆن، ناوی جادەکان... بەڵێ، من هەروا دەکەم! یان ئەوە ڕووی داوە؟"

ئاخ، بەڵی، پاتریك، منیش بە تاریك و ڕوونی بە بیرم دێت. ئەگەر مەبەستت ئەو کتێبە بێت، کە **45** ساڵ پێش ئێستا نووسیوتە؟

پاتریك مۆندیانۆ، سی جار لەسەر یەك سی ڕۆمان هاوشێوەی یەك دەنووسێت، بەتایبەتی زەمەنی ڕووداوی بەسەرهاتەکان، کە سەرجەم دەگەڕێنەوە بۆ ساڵانی شەستەکان و شوێن؛ پاریس بەتایبەتی. ئەم نووسەرە جارێك نەبوو دەنگوڕەنگی خۆی بگۆڕێت، وەکو بیەوێت لە خاڵێك یان فاریزەیەکی ونبوو بگەڕێت لە نووسینەکانیدا، یان لە ساتەوەختێکی لەدەستچوو بگەڕێت تاکو بە نووسینی بکات و قووڵتر ڕۆچێتە ناویەوە، بە شێوەیەك کە هەست بکات... دیمەنەکانی ئەوسای لە ناولەپیدا ڕاگرتووە.[1]

ئەوەی منی گێڕایەوە بۆ لای ئەم نووسەرە، مۆندیانۆ، ئەو هەواڵە نەبوو کە نووسەر براوەی خەلاتی نۆبڵی ئەمساڵە، بەڵکو ئەو ڕەخنە و سەرنجانە بوون، کە لە سەرانسەری ئەوروپا و جیهاندا لە نۆڤێل و ڕۆمانەکانی گیران.

خاڵێك لەو خالانەی کە سەرنجی منی ڕاکێشا و بۆ ئەم بابەتە بەدواداچوونم بۆ کرد، ئەم سەرنجە بوو: لە زیاتر لە **10** کتێبی مۆندیانۆدا یەك دیمەن دووبارە دەبێتەوە، ئەویش خوڵقاندنی ئەو کەراکتەرە هاوشێوەیەیە، (گەنجێك تەمەنی بیست ساڵانە، قژێکی قاوەیی و ڕێکپۆش، جوتێك پێڵاوی قەیفەی پاژنە بەرز).

من بۆ ئەم بابەتە ناچار بووم بچم بۆ کتێبخانەی گشتی، بۆ گەران لە مۆدێلی ئەم کەراکتەرە لە نۆڤێل و ڕۆمانەکانی مۆندیانۆدا، ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا، کتێبی یەکەمی بوو "جێگای ئەستێرە"، کە هەمان مۆدێلی کاراکتەری ناوبراو بێ جیاوازی بوونی هەبوو، بێجگە لەوە... وێنەی سەر بەرگی کتێبەکە، گەنجێکی قژ قاوەیی ڕێکپۆش، لاو دیارە و پێڵاوەکانی قەیفە دیارن.

بۆ بەراوردکردنی مۆدێلی ئەم جۆرە کەراکتەرە... هەنووکە لە چەندین کتێبی تری نووسەردا بوونی هەیە، بەلام بە دەوری جۆراوجۆر... سەرەکی یان لاوەکی، کە بە تەواوی هاوشێوەی وێنەی سەردەمی لاویی مۆدیانۆ خۆیەتی.

بێگومان دەبێت ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە چەندین نووسەر و ڕەخنەگریش هەبوون،



که ڕای جیاوازیان هەبوو دەربارەی بەرهەمەکانی مۆندیانۆ، ئەگەر لێرەدا پوختەی ئەو بۆچوونانە لە چەند دێڕێکدا کورت بکەینەوە:

(مۆندیانۆ کار دەکات لەسەر کاراکتەر و ڕەوشتی تاك، بەتایبەتی کات و تەمەن چ کاریگەرییەکیان هەیە لەسەر ئێمەی مرۆڤ، ڕاستە کە مۆندیانۆ زۆر جار لە سنووری پاریس تێناپەڕێت و ساڵانی شەستەکان و گەڕان بە ناو دیمەنەکانی سەردەمی منداڵیدا لە کتێبەکانیدا دووبارە دەبنەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئێمە تەنها بە ڕەش و سپی لە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە بڕوانین، لە کاتێکدا ئێمە باس لە هونەری نووسین دەکەین، کە ئەبستراکتە و هیچ یاسا و ڕێسایەك ناتوانێت بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە).

سەرچاوە:

- Boek.nl
- groene.nl/artikel/de_nocturnes_van_patrick_modiano
- schrijvenonline.org



# باڵندەکەی من

خوێندنەوەی کتێب

ئەدەبی سەردەم




# مەرگەساتەکانی ژن، لە ڕۆمانی باڵندەکەی من ـ دا

## خوێندنەوەی: محەمەد کوردۆ

(باڵندەکەی من) ڕۆمانێکی **104** لاپەڕەیی (فەریبا وەفی)یە، کە (ڕەسوڵ وەیسی) کردوویەتی بە کوردی و لە ساڵی **2011**دا بەڕێوەبەرایەتیی بڵاوکردنەوەی هەولێر و دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی بە هاوبەشی چاپیان کردووە. ئەم ڕۆمانە کە لە ڕووکاردا لە ڕێی گێڕانەوەیەکی پۆستمۆدێرنانەی ناپەیوەست بە شێوازە تەقلیدییەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ کات و شوێن و ڕووداودا، بەشێك لە ژیانی حەسرەتزەدەی خێزانێکی هەژارمان بۆ دەگێڕێتەوە، لە قووڵاییدا زۆر شتی دیکەمان پێدەڵێت. لەگەڵ ئەوپەڕی

سادەیی بەسەرهات و ڕووداوەکاندا، جۆرێکی تایبەت لە ئەفسوونی گێڕانەوە بوونی هەیە، کە دەتوانێت خوێنەر پەلکێش بکات و چێژێکی زۆری پێببەخشێت. هەستم کرد نووسەر دەیەوێت بە خوێنەر بڵێت: ئەگەر ئەفسوونی گێڕانەوە ڕاستەقینە بێت، هیچ مەرج نییە بەسەرهات و ڕووداوەکان گەورە و مەزن بن. بەڵام ئەمە هەرگیز بەو مانایە نییە، کە لە پشتی ڕووداو و بەسەرهاتە سادە و بچووکەکانەوە ئازار و خەونی گەورە بوونیان نەبێت. لای (فەریبا وەفی)، بە تایبەت لە ڕووکاردا، شتەکان سادە و هاکەزایی و ڕۆژانەیین، بەڵام لە پشتیانەوە، یان لە قووڵاییاندا دۆزگەلێکی ئاڵۆز و پڕبەها و جەوهەریی هەن. (فەریبا) لەو نووسەرانە نییە، کە هەوڵ دەدەن لە پشتی دۆز و مەسەلە گەورەکانەوە کەمدەستی و بێقسەیی خۆیان بشارنەوە، بەڵکو لەو نووسەرە کەم و دەگمەنانەیە، کە دەتوانن دەستڕەنگینی و پڕقسەیی خۆیان لە ڕێی بچووکترین و سادەترین مەسەلەکانەوە پیشان بدەن. لەم ڕۆمانەدا بەبێ ئەوەی کێشەی سەرەکی مەسەلەی ژن بێت، زۆر قووڵ و جەوهەریی، بەڵام ناڕاستەوخۆ و لە پشتی کێشەکانی دیکەی ژیانی ڕۆژانەی خێزانێکی هەژارەوە، قسە لەسەر کێشەکانی ژن کراوە. ئەم ڕۆمانە لە ڕووکاردا بەسەرهاتی خێزانێکی هەژارە، کە پیاوی ئەو خێزانە هەوای سەفەرکردن بۆ کەنەدا لە سەری داوە. ((دایکم دەڵێ هەر کەس باڵندەیەکی هەیە. ئەگەر بفڕێ و لە شوێنێ بنیشێتەوە، خاوەنەکەشی بە دوای خۆیدا دەکێشێ- ل**66**)). باڵندەی پیاوی ئەو خێزانە فڕیووە، وەلێ سەفەرکردنی ئەو پیاوە، هیچ نەبێت لەم خوێندەوەیەی مندا، ڕووکاری ڕۆمانەکەیە. ئەوەی لە قووڵایی ڕۆمانەکەدا دەگوزەرێت، مەرگەسات و ئازارەکانی ژنە، کە بە شێوازی جیاجیا گوزارشتیان لێکراوە. پاڵەوانی سەرەکیی ڕۆمانەکە، کە گێڕەرەوەی ڕۆمانەکەشە، ژنێکە. بەڵام من وەك ژنێك نایبینم. لای من یەك ژن نییە. ملیۆنان ژنە. بەڵام بە سیغەی تاك قسە دەکات. ئەم ژنە نوێنەرایەتیی ملیۆنان ژن دەکات، کە ژیان بۆ ئەوان لێوانلێوە لە چەوسانەوە و سەرکوتکردن و پلیشانەوە. ژیان بۆ ئەو ژنانە وەك کارگەی بەرهەمهێنانی نادادپەروەیی وایە. ژیانی ئەوان پڕپڕە لە ئازار و نەگبەتی و نەهامەتی. سەرەتای نەگبەتیی ئەم ژنانە بۆ کاتێك دەگەڕێتەوە، کە هێشتا ئەوان بوونیان نییە، ئەوان لە بری خۆیان نایەن، لە بری خەڵکی دیکە دێن، واتە بە هەڵە دێن، وەك هەڵەی چاپ، هاتنی ئەوان خێزان نائومێد دەکات: ((بوونم هیچ واتایەکی نەبوو. دایکم کە دووگیان بوو، بە هیوای کوڕ بوو نەك کچ- ل**62**)). دواتر کە دێن ((پشت چاکەتی بابم تەنیا نیشانەی من بوو. لەوە دەترسام ئەگەر چاوی لەسەر هەڵگرم، ون بم- ل**78**)). ئەوان لە ترسی ئەوەی ون نەبن، چاویان لەسەر بابیانە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە خۆی خودی ونبوونەکەیانە. ئەوان لەبەر بابیان ناتوانن خۆیان



ببینن. بابیان واتە بابسالاری، ئەو هێزە فریوودەرەی هەم ونیان دەکات و هەم وەهمی ئەوەیان پێدەبەخشێت کە ئەوەی ناهێڵێت ون ببن، ئەوە. گێڕەرەوە کە پاڵەوانی سەرەکیی ڕۆمانەکەشە و نوێنەرایەتیی ملیۆنان ژن دەکات، لە سەرەتای گێڕانەوەکانیدا دڵخۆشە، چونکە دوای ئەوەی نۆ جار ماڵی گواستۆتەوە، بۆ یەکەم جار هاتۆتە ناو خانووی خۆی. ئیدی لە کرێچێتی ڕزگاری بووە. دڵخۆشە بەوەی ((دەتوانێت لە ئێستا بە دواوە خووی وسوسکردن وەك خوویەکی هەژارانە بۆ هەتاهەتایە وەلا بنێت))، دەتوانێت واز لە کچ و کوڕەکەی بێنێت بە ئارەزووی خۆیان یاری بکەن، چونکە ئیدی کرێچیی کەس نین، ئیدی کەس نایەتە گیانیان. کە بۆ یەکەم جار لە وەڵامی پرسیاری ئەوەی کرێچین یان خاوەنخانوو، دەڵێت خاوەنخانوو، سەری لە چێژی شیرینی وتەکەی خۆی سووڕ دەمێنن. دەڵێت: ((ئەم وتەیە گەورەی کردووم، چیتر داماو نیم، چیتر ئاوارە

# باڵندەکەی من

فەریبا وەفی

و: ڕەسووڵ وەیسی

ڕۆمان



نیم، ئەم دیوارانە هی خۆمانن، ئەم پێپلیکانە هی ئێمەیە. ئەم حەمام و ئاودەستە هی ئێمەن. سیحری ئەم وتەیەم بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەگەڵە. باوەڕ ناکەم تەنیا یەك وشە بکارێ شوێنێکی ئاوا لەسەر مرۆڤ دابنێ. قەت نەمدەزانی خاوەنخانووەکان دەشێ تا ئەو ڕادەیە دڵخۆش بن- ل13)). ئەم ژنە کە ئەو هەموو دڵخۆشییەی بە هۆی (خانوویەکی قەنناسی پەنجا مەتری، لە گەڕەکێکی قەرەباڵغی وڵاتێکی جیهانی سێیەم)دا بۆ دروست بووە، هەر زوو، لێی تێك دەدرێت. بەر لەوەی تەنها ساڵێکی بەسەردا تێبپەڕێت، (ئەمیر)ی مێردی پێی دەڵێت: ((خانووەکە دەفرۆشم)). ئەم ژنە کە نوێنەرایەتیی ملیۆنان ژن دەکات، دڵخۆشییەکەی دەفرۆشرێت، کوڕەکەی حەزی لە دووچەرخەیە و ناتوانێت بیکرێت، کچەکەی هاوڕێکانی دەبینێت: ((نانەقەیسی دەکڕن، بەستەنی دەکڕن، چلورە دەکڕن))، بەڵام ئەو پارەی نییە ئەو شتانە بکرێت. ئەم ژنە لە تەمەنی حەوت هەشت ساڵیدا تێدەگات ((یەکەم سامانی ئەو بێدەنگییەکەیەتی))، ڕۆژێك باوکی دەیباتە ژێرخان لێی دەپرسێت: ((دوێنێ لەگەڵ پورە مەحبووبت چووبوونە کوێ؟)) زمانی لە گۆ دەچێت، لە ترسان نەك لە ئاقڵییان. غەریزەی پێی دەڵێت ئەو پرسیارەی لە ژێرخاندا بێ ئەوەی چرا هەڵبکەن لێتی دەکەن، وەڵامەکەی ڕووداوی دڵتەزێنی لێدەکەوێتەوە. ئەم ژنە تا لە ماڵی بابێتی، لە سندوقێکی پڕ ڕاز دەچێت، کە دەچێتە ماڵی ئەمیر، ئەو سندوقە پڕ ڕازە نامێنێت، چونکە ئەمیر لە بێدەنگیی ئەو جاڕز دەبێت. بێدەنگیی ئەو دەیترسێنێت. بەڵام ساڵانی دوایی تێدەگات قسە تەنانەت دەتوانێت حەشارگەیەکی باشتر لە بێدەنگی بێت. واتە ئەم ژنە کە نوێنەرایەتیی ملیۆنان ژن دەکات، لە هەموو بارەکاندا دەبێت خۆی بشارێتەوە، دەبێت پوورە مەحبوبەی بشارێتەوە، دەبێت شادیی کچی بشارێتەوە، دەبێت هەموو کچ و ژنەکان بشارێتەوە. پورە مەحبوبە و شادی و کچ و ژنەکانی دی کێن؟ وێنەکانی دیکەی هەمان ژنن. پیاوەکان کە لە باوك و کوڕ و براکاندا خۆیان نمایش دەکەن، دەتوانن هەموو شتێکی دایك و خوشك و کچ و ژنەکان بە شاراوەیی قبوڵ بکەن، بەڵام هەر شتێك لەوان ئاشکرا بێت، ئەگەری ڕوودانی کارەسات بە دوای خۆیدا دەهێنێت. لەبەر ئەوە، پێویستە لەسەر ئەم ژنەی ناو ئەم ڕۆمانە ئەوەی نەیتوانی بە بێدەنگی بیشارێتەوە، بە قسەکردن بیشارێتەوە. ئەم ژنە لە بارەی دایکییەوە دەڵێت: ((دایکم نازانێ لەبەر چی بۆتە هاوسەری بابم- ل30)). ((دایکم لە خەویشدا دەگریێ. گریانەکەی پێوەندی بە پیرییەوە نییە. ئەو کاتەش کە باوکم میوانی دەهێنایەوە و دەستوری شێوی دەدا، دەنگی گریانەکەی لە ژێرخاندا دەنگی دەدایەوە. لە هۆدەکان دەنگی دەدایەوە. لە حەوشە دەنگی دەدایەوە... دەنگی گریانی دایکم لە دار و دیوار و لەشمان تێپەڕی و



درێژەی کێشایە نێو خەونەکانمان)). دایکی کێیە؟ هەر خۆیەتی، وێنەیەکی دیکەی هەمان ژنە. ئەم ژنە بەم جۆرە دەیەوێت پێمان بڵێت: من وێنەی جۆراوجۆرم هەیە، بەڵام هەموو وێنەکانم حەسرەتبارن. کە دایکمم، لە خەویشدا دەگریم، کە پوورە حەبیبەم، براکانم بە دوامەوەن، کە خۆمم، دڵخۆشییم دەفرۆشرێت، کە شادیم، ناتوانم وەك هاوڕێکانم نانەقەیسی و بەستەنی و چلورە بکڕم. ئەم ژنە نایەوێت وێنەکانی دووبارە ببنەوە: ((لەوەی کە کچەکەم وەخۆم بچێ بێزارم. لەوەی کە ئەمن وە دایکم یان شەهلا بچم جارڕزم- ل**36**)). ئەم ژنە کە نوێنەرایەتیی ملیۆنان ژن دەکات، ترس لە ناو خۆیدا ونی دەکات. ((لە تاریکی، لە ژێرخان، لە نسێکان، لە ئاپۆ قەدیر و تەنانەت لە دایکی و پوورە مەحبووبیش دەترسێت. ئەم ژنە ون دەبێت، ونبوونێکی قووڵ کە دۆزینەوەیەك لە ئارادا نییە و هیوایەکیش بە دی ناکرێت- ل**36**)). درەنگ، ((دوای ئەوەی گەلێك ساڵ دەخایەنێت لێی عەیان دەبێت مرۆڤ پێویستی بە هاوارە. پێویستی بە دەنگی بەرز هەیە تاکو لە کاتی خۆیدا بە ناعیلاجییەوە بیبیستن و دەنگی ئازاردەری دەوروبەری ببڕێتەوە. تێدەگات بۆ ئەوەی وەبیریان بێتەوە کەسێکی تر لە هەمبەریان دانیشتووە پێویستی بە هاوارە- ل**39**)). بێگومان هاوارەکانیش گەلێك ساڵیان دەوێت تا کاری خۆیان دەکەن. ئەم ژنە نوێنەرە هەندێ جار ((شوێنی بۆ سەرگەردانبوونیش دەست ناکەوێت- ل**46**)). جارێکیان بە ئەمیری مێردی دەڵێت: تێر بووم. ئەمیر دەپرسێت: لە چی؟ دەیەوێت بڵێت لە تۆ، بەڵام نایڵێت، چونکە گوتنی ئەو وشەیە هەموو شتێك تێك دەدات- ل**46**. لێرەوە، ئەم ژنە لەبری خۆی و لەبری هەموو ئەو ژنانەی نوێنەرایەتییان دەکات، دەمانباتە ناو باسێکی دیکەوە، کە باسی کاڵبوونەوەی هاوسەرگیرییە. لە جێیەکدا دەڵێت: ((ژیانی هاوسەری ئەگەر درێژەی کێشا، پێستی ژن دەست بە ئەستووربوون دەکا. لە ڕواڵەتدا حەساس و زەریفە بەڵام ئەستوور بوو- ل**82**)). ئەمە وا دەکات دواجار قۆناغێك دێت، نە پیاوەکان شوون و نە ژنەکان هاوسەر، بەڵکو ئەوان تەنها دوو ئینسانن لە پاڵ یەك و لە داڵدەی یەکتردا- ل**75**. ئەمەش ئەگەر بۆ پیاوەکان یەك جار سەخت بێت، بۆ ژنەکان دووجار سەختە، چونکە لەم کۆمەڵگە دواکەوتووانەی خۆماندا، زۆرێك لەو مافانەی سیستمی پیاوساری بۆ پیاوی دابین کردووە، لە ژنی زەوت کردووە. ئازاری ژن بە بەراورد لەگەڵ ئازاری پیاودا، دووبەرامبەرە. بۆیە دەتوانم جارێکی دیکە پێداگری لەسەر ئەوە بکەم، کە ئەگەر بچینە ئەودیوی بەشە ڕووکەشەکەی ئەم ڕۆمانەوە، دەتوانین هەست بەوە بکەین کە ئەم ڕۆمانە لە قووڵاییدا هەوڵدانە بۆ جۆرێکی دیکە لە نووسینەوەی مەرگەساتەکانی ژن.



لە ژمارە (8) گۆڤاری ئەدەبی سەردەمدا، لە گۆشەی دوو چیرۆك و دوو چیرۆكنووس، بە داخەوە بەشێك لە سەرەتای چیرۆكەكەی كاك ڕەووف بێگەرد (شار) پەڕیبوو كە بێگومان كاریگەری لەسەر بونیاد و مانا و كۆی بەرهەمەكە هەیە. هەروەها بەشی دووهەمی ئەو نووسینەی كە نووسەر لە بارەی چیرۆكەكەیەوە نووسیبووی و ڕووناكییەكی بەجێ بوو بۆ سەر مەبەست و ڕەهەندە فیكرییەكانی چیرۆكەكە و بەپێی نەریتی هەمیشەیی ئەو گۆشەیە لە گۆڤارەكەدا دەبوو بڵاوبێتەوە، ئەویش بە هۆی هەڵەیەكی نەخوازراوەوە بەر مقەستی لە یادكردنەوە كەوتبوو. لێرەدا لەگەڵ داوای لێبووردن لە كاك ڕەووف و تەواوی خوێنەرانی گۆڤارەكە دەقی نووسینەكە و لە كۆتایی وتارەكەیشدا دەقی چیرۆكەكە بڵاو دەكەینەوە.

ئەدەبی سەردەم

ڕەووف بێگەرد

# دوو چیرۆك

# دوو چیرۆك نووس

ئەدەبی سەردەم

# چیرۆکی (شار).. واقیعێکی بە فانتازیاکراو.

لەو چرکەساتەدا کە پرسیارەکانت بەر دیواری بێدەنگیی دەکەون و بێزاریی وەك گەردداوێکی فێ لێ هاتوو تەوقت دەکات. ئیتر هیچ نامێنێتەوە جگە لەوەی وەك ئەو ئەسپەی هەستیی مەترسیی ڕێگا ڕایدەگرێت و سەری ڕۆیشتن بۆ سوارەکەی نەوی ناکات، تۆیش لە پڕێکدا لە بەردەم ئاهێکی کتوپڕ و، وتەیەکی بە ڕێکەوت و ، هەواڵێك، جووڵەیەکی بچووکی بە ئاماژە و تەنانەت هەناسەیەکی سووکەڵەیش کە لای تۆو بۆ کارەکەت کێشیان لەوە زیاتر دەکەوێتەوە کە خۆیان هەیانە یان

بە پێچەوانەوە. دنیا پڕ لە مەراق و هەستە وروژاوەکەت دەدەیتە دەست ئەو جەستە باریکە پڕ لە ویژدانەی ژیانی مانەوەی خۆتی تیا دەبینیتەوە. کەچی زۆری پێ ناچێت، هەر دوای ئەوەی ڕۆحی خۆیت پێ دەبەخشێت، بێ نازکێشان فڕێی دەدەیت. بەڕاست هیچ نووسە رێك بیری لەوە کردۆتەوە ئەگەر قەڵەم نەبوایە ئەم دنیایە چی بەسەر دەهات! من لە پاڵەپەستۆی بەردەم ئوتوبوسێکدا گوێم لە کوڕێکی گەنج بوو بە ژنێکی بەردەمی خۆی وت: دەی پیرێژن زووکە سەرکەوە. ژنە ئاوڕی لێ دایەوە، وەك ئەوەی تێزابت بەسەر ڕوویا کردبێت لە هەردوو چاوییەوە بڵێسەیەك بەرەو ڕووی کوڕەکە زمانی دەکێشا کە خۆم نەمزانی هەمان تێزابی کوڕەکەیە یان هەناسەیەکی گڕگرتووە کە سەرشارە لە داخ و حەسرەتی و بە ئاشکرا دەڵێت: (کوڕەکەم، جگە لەو وشەیە هیچی ترت نەبوو پێم بڵێیت؟ ئاخر من چیم لە ژیان چەشتووە تا ببم بە پیرێژن!) کەچی هیچی نەوت. تەنیا ئەوەندە نەبێت کە لە ڕیزەکە دەرچوو وازی لە سواربوونی ئوتوبوسەکە هێنا. من چ گومانی ئەوەم نەکرد کە ئەمە یەکەمجاری ژنەکەیە گوێی لە قسەیەکی وا بووبێت. بۆیە چیرۆکێکی بە دڵی خۆمم بۆ نووسی بە ناوی (لەبەر ئاوێنەکەدا) کە لە چیرۆکە خۆشەویستەکانمە و ڕەنگە یەکەمجارم بووبێت بتوانم برۆمە ناو ناخ و خەونی ژنێکەوە و هەموو وێناکانیشم- هیچ نەبێت بەلای خۆمەوە- ڕاست دەرچووبن. ژنەکە، لە ژوورە تەنیا و چۆڵەکەیدا، لەبەردەم ئاوێنەیەکی بالآنمادا وەستاوە، چیرۆکی ژیانە پڕ لە کارەسات بارەکەی خۆی بۆ ئاوێنەکە دەگێڕێتەوە. لەگەڵیا تەماشای سەروو چاو و قژ و سنگ و بەرۆکی خۆی دەکات و لەگەڵیاندا دەدوێت. پاشان تەواو وەك ئەو بەردی سەبرەی بە منداڵی زۆرجار نەنکم چیرۆکەکەی بۆ گێڕاومەتەوە، ئاوێنەکە لەبەردەم ئەو بەسەرهاتە تراژیدیانەدا خۆی پێ ناگیرێ و دەکەوێت و پەراش پەراش دەبێت. ژنەکەیش لەناو ئەو هەزاران وردە شووشەیەدا گیانی دەردەچێت.



دەمەوێت بڵێم گەلێك لە چیرۆکی نووسراوی ئێمە لە ڕاستیدا چیرۆکی خۆیان هەیە. بەو مانایەی واقیعێك لە ئارادایە ئەگەر تۆ بتوانیت یارییە هونەرییەکانی خۆتی تیا بکەیت. بەڵام قۆستنەوەی ڕووداو و هێماکان چۆن دەکەونە بەر زەینی نووسەر ئەمەیان تەواوی کێشەکەیە. بۆیە هەر چیرۆکێك لای خودی نووسەرەکەی چێژ و تایبەتمەندیی خۆی هەیە و ناتوانێت لای کەس بیدرکێنێت کە کامیانت زیاتر خۆش دەوێت. بەڕاستی ئەمەیان کاری خوێنەرە کە ئەویش زۆرجار چێژەکە دەکات بە پێوانە و ئەو ڕەگەزەیش بەردەوام لە هەڵکشان و داکشاندایە و لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دە گۆڕێت.



من لەکاتی خوێندنەوەی شانۆگەرییەکی تراژیدیدا قسەیەکی (کریۆن) م هاتە بەرچاو کە دەڵێت: "شار ژنی شەرعیی فەرمانڕەواکانیەتی". ویستم بە پێچەوانەوە دژوازیەك بۆ وتەکە دروست بکەم کە هیچ مەرج نییە شار (گەل، جەماوەر، خاك) ژنی شەرعیی فەرمانڕەواکانی بێت. بەڵکو شار لە دیدی زانا و خەڵکانی هۆشیارەوە، چاوێکی کراوەیە بۆ ڕێ بەدی کردن و ڕەت کردنەوەی ئەو بڕیارە نادروستانەی فەرمانڕەواکانی دەیدەن.

من بەو نیازە دەستم پێکرد. کەچی پارادۆکسێك دەستی لەرزاندم و بەرەو ئاقارێکی تری بردم کە نەتوانم لە گۆڕینی واقیعێکەوە بۆ فانتازیا بەهەمان ڕیتم و بونیادەوە کارەکە ئەنجام بدەم و کۆتاییەکەی بە گەشبینی بهێنم (زۆربەی هەرە زۆری چیرۆکنووسانی دنیا لەسەر ئەوە کۆکن کە لەکاتی نووسیندا نەیانزانیوە کۆتایی چیرۆکەکانیان بەچی دەشکێتەوە. بەڵکو ئەوە پەیوەندی بە ڕەوت و تیمای بابەتەکەوە هەیە، تەنانەت لەکاتی گریمانە کردنی چەند کۆتاییەکدا لەدوا جاردا بە هیچیان نەشکاوەتەوە و شتێك دەرچووە هەرگیز نووسەرەکە خەیاڵی لای نەبووە) من بۆ ئەو بە فانتازیا کردنە پشتم بە دوو زەمەنی جیاواز بەستووە کە بە تەمەنی منداڵەکەوە بەستراونەتەوە. منداڵییەکی ئاسایی پڕ لە پرسیاری سادە و ساکار وەك ئەوەی لە دەقی چیرۆکەکەدا هەیە. لە ڕاستیدا ئەگەرچی پرسیارەکان بە زمانی سادە کراون، بەڵام بن گۆمی زۆری تیایە. بۆیە منداڵەکەیش- لە دەرەوەی چیرۆکەکە- هەر منداڵێکی ئاسایی نییە. لە هەردوو زەمەنەکەدا هەست بە حەشەریەتێك دەکەیت کە سەرچاوەکەی دەسەڵاتە. یەکێکیان سێکسی و ئەویتریان سیاسی. لای (فرۆید) هەموو شتێکی تیژ هێمای سێکسییە (شیشی گۆشت برژاندن، دار دەستی نوك تیژ و چەکمەی ئاوزەنگی دار).

بەڵام ئەوانەی تووشی حەشەریەتی سیاسی دەبن کۆ لە هیچ کردەوەیەکی ناردوست ناکەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، تەنانەت دەست بۆ حەرامترین و قێزەونترین کاریش دەبەن کە لاقەکردنی دایکیانە.

ئەوەی وەك ئەنجام بە تەنیا دەمێنێتەوە و پەراوێز دەخرێت دەستکەوتە مەعریفییەکەیە کە ئەمەیان جەوهەرە ڕاستەقینەکەی هەموو کۆمەڵگایەکی دواکەوتووە.

ئیتر لەم دۆخەدا تۆ دەبێت یان ڕۆحێکی فاوستیانەت هەبێت بۆ خۆکوژی، یان دڵێکی پڕ لە ڕق و

قینی وەك ئۆتیلۆت هەبێت بۆ کوشتنی خۆشەویستترین کەست. یان دەبێت وەك فاوستۆس ڕۆحی خۆت ببەخشیتە شەیتان بۆ ئەوەی مەعریفەیەکی هەمەلایەنەی سەر زەویت دەست بکەوێت. بە هەر حاڵ لەنێوان ئەم هەموو گریمانانەدا تۆ خاوەنی ڕا و زەنگی مەترسیدارانەی خۆتیت کە دەبێت هەر لێی بدەیت- ڕەنگە تەنیا نووسەر ئەم سەرسەختییەی پێ بکرێت- بەڵام من دەمەوێت ئەوە بڵێم لە کۆمەڵگەیەکدا کرم و خۆرەی ملکەچ کردن و گیانی کۆیلایەتی هەموو پارچە و بەشە سەرەکییەکانی داگیر کردبێت و کەسێك نەبێت گوێ لە دوکتۆر –ستۆکمان- بگرێت، ئەو کۆمەڵگایە شایانی ئەوەیە هەموو نەفرەتییەکانی خۆتی بەسەردا داباریێنیت و پێی بڵێت تۆ لەنێو قەدەرێکی ئۆدیبیدا دەژیت.. ئایا ئەمە دەزانیت؟!!





# شار

**ڕەووف بێگەرد**

ئەو بەیانییەی ڕۆژی هەینی، کە خەڵکی لە خەوی قورسی شەوی ڕابردوویان بەئاگا هاتن و سەری دیواری کۆڵان و شەقامەکانیان بە نووسینی ئەو وتەیەوە بینی، زانییان کە دەستێك خۆی داوەتە بەر سکڵی ڕق و داخی بەرودوای شاری ڕشتووە، وتەکە هێندە بە خەتێکی درشت و جوان نوسرابوو، کە کۆلکەخوێنەرێکیش لە هەقی خۆیندنەوەی دەهات، شار کە چاوی بەو نووسینە کەوت، وەك بارێکی لاسەنگی لێهات و ڕیتمی شتەکانی گۆڕا. ئیتر هەر ئەو ڕۆژە- ئەگەرچی ڕۆژی هەینی لە سەرانسەری وڵاتدا ڕۆژی دەستگرتنەوەیە لە کار و پشووی هەفتەیە- بەڵام ئەنجومەنی

وەزیران بەپەلە کۆبونەوەیەکی نائاسایی کرد، دوای بڕیارێکی خێرا هەموو وەزیر و لێپرسراوانی گەورەی وڵات بەرەو کۆشکە گەورەکەی قەراخ شار چوون، وەك لە پێشبڕکێی ڕاکردنێکدا بن، خۆیان تێخزاند، دەرگایان لەسەر خۆیان داخست، سێبەری ترسەکەی سەرشانیان ئەوەندە گران بوو، تەواو بە دیواری ناو ژوورەکانەوە نووسان، ئیتر شار نە فڕکەفڕکی ماشێنی لێدەهات و نە ژاوەژاوی دەزگا و کارگەکان، نە تەقە و دەستڕێژی ناوەختی چەك و نە بگرەوبکوژەی پۆلیس و ئاسایش، هەواڵەکەش وەك ڕەشەبا هێنابێتی، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا هەموو پێچوپەنای شاری گرتەوە ، خەڵکی شار لە سەرەتاوە کاس بوون و بڕوایان نەکرد، پاشان کردیانە چرپەچرپ و کۆبونەوەی بچووك، لە دڵەوە پێدەکەنین و یەکەم جاریان بوو هەست بەوە بکەن، کە سەریان سووکە و ترسێکی مۆتەکەئامێزیان لە کۆڵ بۆتەوە، تەنانەت منداڵێکی تەمەن دە دوانزە ساڵەی قوت و قسەزان لە دایکی پرسیبوو:

-دایە ئەوەکێ مردووە؟ دایکی وەڵامی دابوەوە کوڕم مەبەستت چییە؟ منداڵەکە وتبووی: ئەی ئەوە نییە شار لە ڕۆژانی تری ناچێت و زۆر بێدنگە!

دایکی وتبووی : کوڕم حکومەت مردووە.

منداڵ: حکومەت یانی چی؟



دایك: حکومەت یانی ئەو کەسانەی شەڕ هەڵدەگیرسێنن، خەڵکی لە یەکتری بەرئەدەن، نانی میللەت ئەبڕن و خۆشیان لە هەموو کەس بە گەورەتر ئەزانن.

منداڵ: ئا! ... خۆیان بە گەورەی خەڵك ئەزانن! ئەی حەز لە چی ئەکەن؟

دایکی دوای کەمێك بیرکردنەوە پێی ووتبوو: ئەی تۆ حەز لە چی ئەکەیت؟ منداڵەکەیش دوای کەمێك بیرکردنەوە وتبووی: حەز ئەکەم گەورە ببم و بفڕم و گۆشتی برژاویش بخۆم.

دایکی وتبووی: ئا! گۆشتی بەشیشەوەکراوت مەبەستە! زۆڵ! ئیتر چەپۆکێکی پیا کێشابوو.

منداڵەکە کەوتبووە دوای لێکدانەوە و قسە و چەپۆکەکەی دایکی و لە شوێنێکدا مت ببوو، جارجارەش وێنەی گەورەیی حکومەت و شیشەگۆشتێکی دەهاتە بەرچاو، لەتاوا ناوگەڵی خۆی دەخوراند و دەستیشی بەسەر ورگیا دەهێنا، لەبەر خۆشیەوە دەیگوت: جاکێ حەز لەو شیشە گۆشتە ناکات، کە کەفوکوڵی هەموو گیانت دادەمرکێنێتەوە.





هونەرمەندە شانۆکارەکانی ناو شار لە وتەی نوسراوی سەر دیوار و بڕیارە ترسنۆکەکەی حکومەت سەرسام بوون. وتیان ئەم وتەیە قسەی سەدان ساڵ لەمەوبەرە، (کریۆن) لە تراژیدیای کۆنی ئۆدیبدا وتوویەتی و پەیوەندی بە ئێستاوە نییە، ئیتر حکومەت بۆ لەرزی لێهاتووە و ڕای کردووە؟
ئەم قسانەی هونەرمەندان زوو بڵاوبووەوە، سیخوڕەکانی دەوڵەتیش کە بە جلی ژنانەوە خۆیان لە پەناوپاسارەکاندا گرتبوو، گەیاندیانە گوێی حکومەتی ترساوی ناو کۆشك، بەڵام لێپرسراو و فەرمانڕەواکان لەوە عاقڵتربوون کە بەم قسانە تەفرە بخۆن و بڕیارەکەیان بشکێنن، ڕاستە وتەکە هی سەدان ساڵ لەوەوبەرە، بەڵام بۆ هەموو کات و شوێنێك دەشێت و کاری جگەربڕانەی خۆی دەکات، خۆڕایی نییە کە تەنانەت لە سەنتەری شار و لەسەر دیواری بارەگای سەرەکی‌ی دەوڵەت و ساختمانی ئاسایشی گشتیشەوە نووسراوە، دیارە ئەمە مانای ڕقێکە ئاقڵ درکی پێبکات و قسەی زانایەکە، کە بە ئاسانی خۆی بە دەستەوە نادات، بۆیە لێپرسراوانی شار لەگەڵ هەر دەنگێکی بەرزی دەرەوەدا ڕائەچڵەکێن و پاشان دەچوونەوە یەك، زیاتر خۆیان بە دیوارەکەوە دەنوساند، حەزیان لێبوو کەلێنێك لە دیوارەکە بکەن و بچنە ناوی. کەچی کە ناواخنی وتەکەیان دەهێنایە بەرچاو، چێژێکی سەیر لەشی دادەگرتن، لەبەرچاویاندا شار دەبووە ژنێکی باڵابەرزی گۆشتنی سوروسپی، قژ لە کەمەری چاو سەوزی پڕ لە هەوەس، هەر لەو مابنە ناوچاو مارۆیانە دەچوو، کە لە بەهاری بەتەڵەبیاندا لمۆز دەخەنە سەر دیواری حەوشەیماڵەکان و دەحیلێنن، یان لە دەشت و چیادا چەپۆکانیانە و ئەستێرە لە عەرد دەدەن، هاوار و پرمەیان بۆ ئەسپێکی کەحیلەی بەدەماخە کە بێت و بۆن بە ناوگەڵیانەوە بکات و دایانمرکێنێت، لێپرسراو و فەرمانڕەواکان پڕبەدڵ حەزیان لەو ژنە بۆندارانە بوو، لە دوورەوە دەمیان پڕ دەبوو لە ئاو و لەشیان ئاڵۆشی تێدەکەوت، بۆ کەمێك چاویان دەنایە سەریەك بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە سەر ئەو دیمەنە ونبوانەی کە لافاوی ئارەزوویان تیا سەری دەکرد و وەك ئەسپە کەحێلەکانی بەهار شەڕیان بە داروبەرد دەفرۆشت، تامی یەکبەیەکی

دیمەنی لە ئامێزگرتنی ژنی شاریان دەچێشت و دەتوانەوە، کە چاویان دەکردەوە، سامێك دایدەگرتن، سامەکەش هەر لە وتەی سەر دیوارەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو، ئەگینا لە حاڵەتی ئاساییدا ژن هەر ئەو گۆشتە بەشیشەکراوە برژاوەیە، کە منداڵێکی تازە داندەرکردوویش بە تاسەوە دەیجوێت و تا نەیکاتە تڵپە، دەستبەرداری نابێت، شکاندنی تەلیسمی شار هەروا ئاسان نییە.. لێپرسراوەکان ئەمەیان لە دڵی خۆیاندا دەوت: ڕاستە شار بۆ فەرمانڕەوا پێدەکەنێت، خۆی بۆ شل دەکات و دەچێتە ئامێزی، بەڵام ئەمە بۆ خەڵەتاندنی ئەوانەیە، کە مێژووی شاریان نەخوێندۆتەوە، ئەگینا هەر شارە دەتوانێت کەلاکی نەیارەکانی بەسەر یەکدا کەڵەکە بکات و عەزیاش بخنکێنێت. لێپرسراوەکان ئەمەیان هەر لە دڵی خۆیاندا ئەوت:

- ڕاستە ئەوەی لەسەر دیوارەکانی ناو شار نووسراوە، قسەی کریونە کە دەڵێت: (شار ژنی شەرعیی فەرمانڕەواکانیەتی).. بەڵام شار نهێنیەکیشە بە سەد ڕەنگ خۆی دەگۆڕێت و سەری پڕ لە ئاشووبی بە هەزار ماڵدا دەکات. وەك دەبێتە ژنی ملکەچ، دەشبێتە خەمێکی سەخت -ئەمە هەر قسەی دڵی لێپرسراوان بوو- کەواتە فەرمانڕەواکانی شار ناهەقیان نییە بەبێ ورتە خۆ لە کۆشك بخزێنن، دەست لە پلەوپایە هەڵبگرن و ترسێکی بە ئەندازەی کێوێك بکەوێتە ئەستۆیان. خەڵکی شار کە لە هەڵاتنی حکومەت تەواو دڵنیا بوون، سامی وڕبوونەکەیان تێك شکاند و ڕژانە سەر شەقامەکان، چرپە بوو بە هاوار و هەنگاوی سستی گومانیان ڕەوی، پاچ و خاکەناز و کوڵنگیان لەدەست گرت، سەرەتا پەیکەرەکانی پیاوانی دەوڵەتیان ڕوخاند، پاشان باخیان ئاگر تێ بەردا، قوتابخانە و خەستەخانە و بانکیان تالان کرد، بە هەزاران وێنەی قوتابیانی وردیلەی دوێنێ و پیاوانی سیاسەتمەداری ئەمڕۆیان دایە بەرشەق، درەختیان بڕیەوە، گڵۆپی سەر شەقام و کۆڵانەکانیان شکاند، وتیان: ئەوەی لە دوای ئەوان بەجێ ماوە، پێویستە بێ شوێنەوار بێت، بۆ ئەوەی لەبەرچاوی ئێمە و لە یادەوەری منداڵەکانماندا نەمێنێت، تەنانەت وا کەوتنە هەڵکەندنی قیری سەر جادەکان، کە تا سەر خاکی سوور دەستبەرداری نەبوون، نە پۆلیسێك گرۆی خۆدەرخستنی هەبوو، نە سەربازێك تاسەی شەقام بینینی دەشکا.

منداڵەکە جارێکی تر بە دایکی وتەوە:

- ئەوە دایکە شار بۆ وا خرۆشاوە؟

دایکی وتی: پێم نەوتی حکومەت مردووە.



منداڵ: باشە کە حکومەت دەمرێت کێ زیندوو دەبێتەوە؟
دایك: خەڵکی
منداڵ: خەڵکی پیاوی چاکن؟
دایك: ئەدی.
منداڵ: ئەی بۆ گڵۆپی بەر ماڵەکەیان شکاندین؟
دایك: ئەوەیان کاری منداڵانەیە.
منداڵ: بۆ منداڵ بێعەقڵە؟
دایك: ئەی چۆن!
منداڵ: ئەی منداڵ دەبێت بە حکومەت؟
دایك: تۆ حەز لە شیشەگۆشت دەکەیت؟
منداڵەکە بێدەنگ بوو، جارێکی تر شیشە گۆشتە سوورەکانی هاتنەوە بەرچاو.

*** *** *** ***



پیاوە عاقڵ و زاناکانی شار کە وتەی سەر دیوارەکان بە فیتی ئەوان نوسرابوو، لە بەردەم عەقڵی خۆیان و ڕەفتاری خەڵکیدا بوونە دەستێکی شکاوی لەئەستۆدا هەڵواسراو، ئەیانزانی ئەوەی کردوویانە، ڕاستە و جێگای ئافەرینە، هەر دەبێت حکومەت زیندانی بێت و خەڵك ئازاد، دەبێت جڵەوی دەسەڵات لە دەستی ئەماندا بێت و گوێی لێپرسراوەکانیش وەك میزەڵانی دەستی منداڵ بە فووی ئەمان هەڵئاوسێ و فش بێتەوە، کەچی حکومەت جێی خۆی گرتووە و خەڵکیش ئەگەر وا بمێننەوە، دەبێ ئەمانیش یان سەری عەقڵی خۆیان ببڕن و بکەونە دوای کاروانی سەرگەردانی، یان سەری عەقڵیان هەڵبگرن و وڵات بەجێ بێڵن، هەمووش لەوەدا یەك قسە بوون، کە سەرهەڵگرتن کاری پیاوی ترسنۆکە و مەڕ ئامادەکردنە بۆ گورگ، بۆیە لەناو خۆیاندا وا کەوتنە ڕاوێژ.
- ئێمە نەمان وت شار بمرێت، وتمان ئەوانە بڕوخێنن، کە شاریان کردۆتە ژنی شەرعیی خۆیان.
- حکومەت جینایەتکارە، لەوە دەچێت ئەو خەڵکانەش تۆخمی جیناتی ئەویان

هەڵگرتبێت.

- ئەی چار؟

- پێویستمان بە قارەمانێکە.

- جا کەی باوی قارەمان ماوە؟

- ئەی خۆمان چین؟ ئێمە کە توانیمان ئەو هەموو فەرمانڕەوا زاڵمانە لە کون بخەین، دەتوانین چارێکیش بۆ ئەم کارەساتە بدۆزینەوە.

- ناتوانین، چونکە ئەو پیاوە نین، کە هەوەسی شار تێر بکەین.

- ڕاستە، هەوەسی شار هەوەسێکی دڕندانەیە، بە ئێمە سەرکوت ناکرێت.

-با سەرەتا وتەکەی کریون لەسەر دیوارەکان بسڕینەوە.

منداڵەکە لە دایکی پرسی:

- دایکە حکومەت مردووە؟

دایکی وتی:

- ئەڵێن مردووە.

- منداڵ: ئەی بۆ هێشتا هەر برسیمانە و شەوانیش دەرگا دائەخەین و ئارام ناخەوین؟

- بڵێم چی، پیاوە ئاقڵەکان وایاندەوت.

- منداڵ: ئەگەر حکومەت زیندوو بێتەوە، وەزیرە سمێڵزلەکە دێتەوە سەر تەلەفزیۆن قسە بکات؟

- دایک: ئەی چۆن؟

- منداڵ: ڕۆژێك ئەو وەزیرە بە پێ بە بەردەم قوتابخانەکەماندا تێپەڕی، دایە ورگی زۆر زلە!

- دایک: وایە زۆر زلە.

- منداڵ: ئەوە کە دەچێتە سەرئاو، بە چی خۆی پاك دەکاتەوە؟

- دایک: بە ئاو.

- منداڵ: ئەزانم بە ئاو، بەڵام چۆن دەستی دەگاتە دواوەی خۆی؟



- دایك: حكومەت دەستی درێژە كوڕم، ئەگەر دەستی خۆشی نەگەیشتێ، بە دەستی یەكێكی تر پاكی دەكاتەوە.
- منداڵ: دایكە حكومەت زۆر گۆشت ئەخوات؟
- دایك: زۆر، بە كاڵی و بە كوڵاوی و بە برژاوی.
- منداڵ: بۆ؟
- دایك: هێزی پێ پەیدا ئەكات، خروی لەشی ئەشكێت و بەئیسراحەت خەوی لێدەكەوێت.
- منداڵ: بۆ حكومەت لەشی ئەخورێت؟
- دایك: بەردەوام كوڕم.
- منداڵ: بۆ؟
- دایك: لە باوكت بپرسە.
- منداڵ: بۆ هەر پیاو ئەوە ئەزانێت؟
- دایك: زۆرتری لێئەزانێت.. ئا..
- منداڵ: حكومەت پیاوێكی زلە، وانییە؟
- دایك: زۆر.
- منداڵ: ژنی هێناوە؟
دایك: ئەی چۆن؟
- منداڵ: باشە ژنەكەی ناوی چییە؟
- دایك: ناوی شارە.
- منداڵ: جا شار كەی ناوی ژنە؟
- دایك: تۆ لەوە تێناگەیت.
- منداڵ: ئەی باوكم تێئەگات؟
- دایك: ئەی چۆن، خۆی شارە.
- منداڵ: یەعنی باوكم ژنی حكومەتە؟

- دایك: بەڵێ
- منداڵ: ئەی تۆ ژنی باوکم نیت؟
- دایك: با، ئەوە من هەر هیچ، باوکیشت وەکو من وایە.
منداڵەکە تەواو سەرسام بوو، هێزی قسەی تری نەما، دەستی بۆ ناوگەڵی برد و قامیشە بچوکەکەی خۆی خوراند، بە دایکی وت:
ـ شیشەگۆشت بۆ کاڵێ باشە دایکە؟
دایکی سەیری ناوچاوی کوڕەکەی کرد و وتی:
ـ بۆ حکومەت.
منداڵەکە لە ناوچاوی دایکی ڕاما و لەبەر خۆیەوە وتی:
ـ خۆزگەم بە حکومەت.

***

ئەو بەیانییەی لەگەڵ خۆر و بان گەرمبووندا پەڵە هەورەکان بەدەم کزەباکەوە کۆچیان دەکرد، خەڵکی شار لەشی خاویان بەرەو پەنا دیوارو چایخانە چۆڵ و بێ چاکان بەکێش دەکرد، ڕەنگیان زەرد و دڕدۆنگ بوون، تەنانەت تاقەتی ڕۆژباشلێکردنی یەکتریشیان نەبوو، لە چاویانا هەستی پەشیمانییەك دەدرەوشایەوە، وایش کەوتنە هەواڵ و گەیاندنی ڕووداوەکان:
-ئاژاوەیەکی گەورەیە و کەس نامەی ئەوی تر ناخوێنێتەوە.
-شار پاسەوانی خۆی بۆ ناکرێت.
-بۆگەنی ئاوەڕۆ شکاوەکان هەمووومانی کاس کردووە.
-کێ دەتوانێت بەبێ سەر بڕوات.
-ئەم زانا و عاقڵانەی شار هەقی لەناوبردنیان هەیە، ئێمەیان پیاوخراپ کرد و خۆشیان ڕەگی پیاوەتیان تیا نییە.
هەر کە وتە کوژاوەکانی سەر دیوارەکانیشیان بینی، ئیتر ئاگری هەڵچوون لە






جەستەیان بەربوو، کەوتنە گەڕان بە ناو دوکانە تالآنکراوەکانی خۆشنووسیدا، ژووره وێرانکراوەکانی قوتابخانەدا، گەڕان، زۆر گەڕان، تا لای شێوەکارێکی نەخۆش چەند فڵچە و ڕەنگێکی تۆزلەسەرنیشتوویان دۆزییەوە، هەر لەسەر هەمان شوێنی کوژاوەی وتەکەی کرێوندا دەستیان بە نووسین کردەوە، لە پێشدا دوودڵ بوون چی بنووسن، تا پیاوێکی مێزەرلەسەری عەبالەشانی پۆشتەوپەرداخ و بەویقاریان لێ پەیدا بوو، وتی هەر لەو شوێنانەدا بنووسن، : (بەڵێ شار ژنی شەرعیی فەرمانڕەواکانێتی) ئیتر لەچاوتروکانێکا دوای نووسینەوەی وتەکەی کرێون لەسەر دیوار و شەقامەکان خەڵکی ڕژانەوە سەر جادە سەرەکییەکان و دەستیان کردەوە بە هوتافکێشان، ئەگەرچی زۆربەی جادەکان هەڵکەنرابوون و خەڵکەکە سەرسمیان ئەدا و ئەکەوتنە چاڵەکانەوە، بەڵام شەکەتی و ئارەقەی سەرسنگ و لاملیان لە هاوار و هوتافی نەدەکردن. هەموو بەرەو ئەو کۆشکە ڕێچکەیان، بەست کە حکومەت خۆی تیا حەشار دابوو، لە بەردەم ئاگری خۆر و دەرگای داخراوی کۆشکا بەچۆکدا هاتن، پاڕانەوە، پاڕانەوەی کۆیلەیەك لە سەردارەکەیء گوناهبارێك لە خواکەی، وەك بەشداریی سرودێکی کڵێسە بن، دەنگی سروود و درودیان بەرزبووەوە، هەموو بە ئیقاعێکی گونجاو وتەکەیان دەوتەوە: (بەڵێ شار ژنی شەرعیی فەرمانڕەواکانیەتی).

هاوار و پاڕانەوە گەیشتە گوێی لێپرساو و سەرکردەکانی ناو کۆشك، ئەگەرچی لە سەرەتاوە دوودڵ بوون، بەڵام بێجگە لە سیخوڕەکانی خۆیان، چەند کەسێکی ناو خەڵکەکەش پێدزەیان کردە ناو کۆشك و بەدەم ئارەقەی پاکانەڕشتنی خۆیانەوە ڕاستیی هەواڵەکانیشیان گەیاند، لێپرساوان گومانیان لە خۆ تەراند، خۆیان لە دیوارەکان دوور خستەوە، کە ئاسەواری شوێنپشتیان سپی سپی ببوو، دەرگای ناوەوەیان کردەوە، کە هوتافەکان زیاتر بوون و دەنگەکان لەبەر گوێیاندا بووە دەنگی ژنێك، هاتنە ناو حەوشەکە و دەرگای دەرەوەیان بۆ کرایەوە، خەڵکەکە لەرزین و لەسەر ئەژنۆ کەوتن، لە دوایانەوە کۆمەڵێکی زنجیر لە دەستوملکراو هەر بە پێوە

وەستابوون و تەماشای دیمەنەکەیان دەکرد، ئەو پیاوانە بوون، کە بە فیتی ئەوان بۆ یەکەمجار وتەی سەر دیوارەکان نووسران و خەڵکی ئازاد بوون، هەموو سەروملی و ناوشانیان ئارەقەی بەر خۆر و بەکێشکردنی زنجیرەکانیان بوو، هەر بە پێوە و لە بەردەمی خەڵکیدا ئەنجومەنی وەزیران کۆبوونەوەیەکی ئاسایی کرد، تیایدا بڕیار درا کۆشکەکە بکرێتە بەندیخانە بۆ ئەو زانا و نووسەرانەی کە دەستیان هەبووە لەو فیتنەیەدا، سەرەکانیان لە سێدارە بدرێت و ئەوانی تریش بە حوکمی هەتاهەتایی و کاری قورس فەرمانیان بەسەردا درا.

خەڵکەکە هاوار و دەستخۆشی و دەمخۆشیان لە حکومەت کرد، لە خۆشیاندا لەسەر پشت کەوتن، شار ئەو ماینە ناوچاو مارۆ بەتەڵەبە بوو، کە بە دوای ئەسپێکی کەحیلەدا دەگەڕا بۆن بە ناوگەڵیەوە بکات، هەفتەیەك بۆ شار سەدەیەك بوو، چۆن لاشەیەك دەتوانێت بەبێ سەر بژی (ئەمە قسەی دڵی خەڵکەکە بوو). فەرمانڕەواکان بە چەکمەی ئاوزەنگی دار و داردەستی نووکتیژەوە لە ناو خەڵکیدا هەنگاویان نا، منداڵەکەش لەگەڵ دایکیا و لە پەنایەکدا وەستا بوو تەماشای دیمەنەکەی دەکرد، لەبەر خەیاڵیا دیمەنێکی دڵگیر و سەرنجڕاکێش بوو، ئارەزوویەکی گەورە شەپۆلی فڕینی دابوو، وایدەزانی ئەویش فەرمانڕەواکەیە و خەڵکەکە لەسەر پشت بۆی کەوتوون، بە پەنجەکانیشی هەر یاری بە قامیشە چکۆڵەکەی ناوگەڵی دەکرد، لەو کاتەدا کە تەواو مەستی دیمەنەکە بووبوو، بە دایکی ووت:

-دایکە منیش حەز ئەکەم ببمە حکومەت.

-بۆ؟

منداڵەکە وتی:

-زۆر خۆشە.

دایکی وتی: چۆن ئەزانی؟

منداڵەکە وتی: دوێنێ لە خەوما هەموو پیاوە گەورەکانی حکومەت بەیەکەوە باڵیان گرتبووەوە و بەسەر شاردا دەڕۆیشتن، هەریەکەیان باڵندەیەکی گەورەی چنگتیژ بوو، لە هەر جێگایەکدا ئارەزوویان بکردایە، پۆل پۆل دەهاتنە خوارێ، هەر یەکەیان شیشێکی گۆشتبرژاندنی نووکتیژی پێبوو، شیشەکەیان وەك شمشێر هەڵدەسوڕاند و وەك گۆچانیش بە ڕێگادا پێی دەڕۆیشتن، حەزیان لە هەرکەسێك بکردایە یان ڕقیان لێهەستایە، پارچەی گۆشتیان لێدەکردەوە و لە شیشیان دەدا، دووکەڵی





گۆشتبرژاندنەکەیان هەر لە تەمی سپی و کەفی دەریا دەچوو، منیش وەك
ئەوان باڵم لێڕوابوو، دوایان کەوتبووم، لە هەر شوێنێك لایان دایە، منیش
دادەهاتمەوە و لە دوورەوە تەماشام دەکردن، بەڵام ڕووی ئەوەم نەبوو
بچمە ناویان، من بچووك و ئەوان گەورە، کە پێیان زانیم ،سەرۆکەکەیان
تێگەیاند، بانگی کردمە لای خۆیەوە و شیشێکی نووکتیژی دامێ، پێی وتم:
- ئەگەر چی منداڵی، بەڵام دوامان کەوە، دەبێت لە تاقیکردنەوەیەکیشدا
سەربکەویت، ئەگینا نابیتە حکومەت، من دوایان کەوتم، نازانم چەندم
پێچوو، بەڵام هەستم کرد لەگەڵیاندا زۆر گەورە بووم و ڕیشوسمێڵم لێڕوا.
منداڵەکە بێدەنگ بوو، دایکی تەماشای کرد، سەیری لێهات کە کوڕەکەی
دەستی لە ناوگەڵی ناکاتەوە، دایکی ویستی ئاگاداری بکاتەوە، یان بیترسێنێ
کەچی کە لە ناوچاوی ڕوانی، خۆی زۆر ترسا، لەبەرچاویا کوڕەکەی گەورە
زۆر گەورە بوو، وەك چاوی فەرمانڕەواکان ئاگری ڕق و ئارەزوو لە ناوچاویا هە
وەك ئەوانیش سامی گرتبوو، دایکی هیچی نەوت، لە بەردەم بێدەنگی و س
کوڕەکەیدا خۆی بۆ نەگیرا، هەستا و ڕای کرد، کوڕەکەی کەوتە دوای، چەندە دای
ئاوڕی ئەدایەوە ،کوڕەکەی هەر دەست لە ناوگەڵ و چاویشی گڕکانە پڕ لە ئ
دایکەکە زۆر ماندوو بوو، لە پەنای خانوویەکی ڕووخاودا کەوت و نەیتوانی
کوڕەکەی گەیشتە سەری و پێی وت: ئەی نازانیت منیش بە تاقیکردنەوەی
حکومەت. دایکی ویستی هاوار بکات، وەك ئەفسوونی لێکرابێت، یان خۆشی پ
بێت، دەنگی دەرنەهات و شل بوو، شلبوونی ماینێك بۆ جوانوو ئەسپێکی دو
خۆی، کوڕە یەکەم نەوەی تازەی حکومەت بوو، کە نێچیرەکەی بە زەلیلی بب
بە ویستی ئارەزووەکەی تام لە گۆشتی دایکی بچێژێت و کەفوکوڵە ئاگراو
جەستە و ڕۆحی خۆشی بە تەواوی دابمرکێنێت.

تەمووزی
**1997**

کتێبی گیرفان
132

کریشنا مورتی

# چاکە و خراپە
# خێر و شـــەڕ

وەرگێڕانی
ئازاد بەرزنجی



کریشنا مورتی
چاکە و خراپە خێر و شەڕ
ئازاد بەرزنجی
١٥٤



# شاعیرانی ئیسپانیای ئەمڕۆ

ئەدەبی سەردەم



# شاعیرانی ئیسپانیای ئەمڕۆ

## داڤید گۆمیس

ئەحمەدی مەلا

**ئەنتەلۆژیای یەک**

داڤید گۆمێس شاعیرێکی لاوە، ئەم دەقانەی لە ئیسپانییەوە وەردەگێڕمە سەر زمانی کوردی و پێشکەش بە خوێنەرانی دەکەم. ئەم دەقانەی ئێرە لە دووتوێی نامیلکەیەکدا بە فۆتۆکۆپی و بە کاری دەستیی ئامادە کراون. گۆمێس تەمەنی ٣٤ ساڵە و لە تەمەنی ٩ ساڵییەوە دەنووسێ، لە بەرشەلۆنە لەدایك بووە و لە کاستییا لامانچا خوێندنی ئۆمانیتێی خوێندووە. نووسین بەشێکی گەورەیە لە ژیانی و دەڵێ نووسین "پێداویستی"یە.
نامیلکە نوێیەکەی نێو ناوە "ئەنتۆلۆژیا ١" و بنەمایەکی پتەوی هەیە. ٩ ناونیشان و هەر دەقێکیشی بە "پێست" ناو دەبات. "پێست" چەند مانایەك لە خۆ دەگرێ، یەکێکیان ئەو ڕێڕەوەیە کە فرۆکەی لەسەر دەنیشێتەوە، یا



پاسکیلسواران وەرزشی لەسەر دەکەن، وەرزشی ئۆتومبێلیش هەڵبەتە "پیست" بەکار دەهێنن بۆ کێبڕکێ.
هەروەها "پیست" بەو ڕەگەزە و ئەلمیتەش دەوترێت، کە ئاسانکاریمان بۆ دەکات بۆ ئەوەی مەتەڵێك هەڵبهێنین، نهێنییەك بدۆزینەوە.
سەرەتا بە دەقێك دەست پێدەکات کە ناونیشانی نییە، لە خوارەوەش نووسراوە "سەرنجی نووسەر" و کۆتایی بەو دەقە هێناوە.
ئەم "سەرنجە" بۆچوونی شاعیرە لەمەڕ کردەی شیعرنووسینەوە. داڤید شیعر دەنووسێ و گەڕەك بە گەڕەك دەگەڕێ و لە دەرگای ماڵان دەدا و پێیان دەڵێ :"ئەم نامیلکەیە تەنها یەك ئیرۆی تێچووە و من بە دوو ئیرۆ دەیفرۆشم".
بازدانێکە بەسەر هەموو شتێك و هەوڵێکی تایبەتی لە خۆناساندن و ناساندنی شیعرەکانی. سەرنجی ناوبراو بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

**دەقی یەکەم :**

"کاتێك ڕووناکیی شیعر دڵ و دەروونت داگیر دەکات و ژیانێکی نوێ دەبەخشێتە دڵت، کە جاران وەکو ماکینەیەکی کۆن ترپەترپی دەکرد، بارستایی ڕۆژگاری لەسەر دادەنیشت؛ کاتێك ڕووناکیی شیعر یەك بە یەك خانەکانت بەسەر دەکاتەوە، هەموو ئەتۆمێکی جەستەت داگیر دەکات و شیعر لە پێستەکەت دادەچۆڕێ، ئا ئەم ڕووناکییە ڕێنماییت دەکات و بەرەو شیکلی جیهانێکی دیکە ئاراستەت دەکات، بە ئیرادەیەکی نوێیەوە، کە تەواو هی تۆ نییە (...) نازانم، بەڵام شتگەلێك هەن، بە تەواوی ژیانت و بۆ هەتاهەتایی تووشی وەرچەرخان دەکەن. نابێ وەکو یەك بێت دوای سەفەری یەکەمی پیاوانی فەزا، یا ئەو سەربازەی دوای جەنگ و کوشتار دەگەڕێتەوە ماڵ. هەمووان، کەم تا زۆر، لە دوای ئەو ڕووناکییەوە، ئیدی وەکو جاران نین. کاتێك ئەزموونی سیحری شیعر دەکەین، شتێکی لەم جۆرە ڕوو دەدات. بەشێك لەو سیحرە، دەمەوێ، لێرە، لە دووتوێی ئەم نامیلکەیە، لەگەڵ ئێوە بەسەری بکەمەوە، چونکە بەڵێ سیحر بوونی هەیە... لێرە ئامادەیە. ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین، لەگەڵ یەکەمین ڕوانین بەرچاومان دەکەوێت".

ئێپیگراف (دەسپێك)

"لەم ساتەوەختەدا پێی دەڵێم: وچانێك! تۆ زۆر جوانی!"

گۆتە

لێرە...

لەو شوێنەی سالآن لەیەك دەدەن و...

گێژاوی ژیانەکان

لە نێو مەرکەبدا دەتوێنەوە،

ئا ئەمە ڕەچەڵەکی هەموو شتێکە.

ساتەوەختیك...

تاقە کاتی ڕاستەقینەیە

کە هەیە.

وەکو ئەوەی ئێستا هەین...

(کاتێك دەنووسم

یا ئەو دەمەی ئەمە دەخوێنیتەوە...)

ئەو دەمە... بە هەققەت

ئەمە شیعرە بوونی دەبێ و

تۆش لە مندا دەژیی.



(پیستی ١)

"تۆ دەبیتە شاعیر" ڕامبۆ

خەونم بینی تۆ ون ببووی لە گەردوون...

منیش لەو نێوەندە بۆت گەڕام -وەك چۆن لە چارەنووس دەگەڕێین-

هەرگیزیش لە سووچی کۆڵانیش نەدۆزرایتەوە.



بەڵام نەمبینیت...
لەو جیهانە شیکل ڕەهایە بۆ خۆت ون بووی.

لەو شوێنانە بۆت گەڕام کە تاق بوون...
لە نێو خەونە ناخۆشەکان ون ببووی، کە شوێنەکەی پێنازانن،
بەڵام نەمبینیت...
هەروەها چاوم بە قەدەری خۆشم نەکەوت.

گریمانی ئەوەم کرد کە لە دەرەوە تۆ نادۆزمەوە...
وازم لە گەڕانت هێنا،
بەڵام تۆ لەوێ بەردەوام بووی؛
ئەوەشم زانی کە تۆ ئیدی ئەوەی لە مندا دەژی
و منیش دەژیم،
ئەو شەوانە زانیم، لە نێو بێدەنگیدا،
بە ئاستەم لە نێو هاواردا لێت دەگەڕام،
وەکو نوزانەوەی زارۆڵێك
کە نایەوێ ونت کات...
کاتێك لێت نەدەگەڕام، ئەودەم زیاتر تۆم دەدۆزییەوە.

لە ناوی تۆم پرسی
-ناوێك بوو کە کەس لە توانایدا نەبوو ڕوونی کاتەوە-
بە کوولەکەی ڕۆحم خەونم بە گۆرانییەکی مەزنەوە بینی،
لە زارمەوە، بە هێوری، بەبێ ئەوەی پێی بزانم، بێدەنگ...
ناوتی هێنا؛

ناوەکە...  لە لاپەڕەی داهاتووە.

شیعر

..................................................................

(پیستی ٢)
ئایا سەیری ڕابردووی هەتاهەتا دەکەی؟
دەگەینە خەونی شین!

بۆ لاورا
١
ڕچەیەکی هەتاهەتا کە پیتەکان دەیگرنە بەر
چەشنی شوێنپێی بەبێ ئاڕاستە کە هەردووك سەیری دەکەین
دەکرێنەوە لە نێو هەوا درزەبارانێکی سووك
بە شیکل و شێوە خۆیان بە جەستەی ڕووناکییەوە هەڵواسیووە.

ئارەزوومەندم وێنەکێش بوومایە -لە گەڵ ئەوەی کە دادەنیشتی
بۆ ئەوەی ئەم هۆنراوانە بخوێنیتەوە-  شێوەیەکی ورد نییە
دوورتر لە سنووری خۆشەویستی، بەڵام دەزانم کە ناتوانم
بە وشە گوزارشتی لێبکەم ئەوەی دەمەوێ پێتی بڵێم؛
تۆ جوانتر گوزارشتی لێدەکەی. تۆ هەستی منی.
وەکو مەرەکەبی ڕژاو، دێڕ بە دێڕ، کەوتبێتە بەر با
شێوەی عیشقێك کە لەگەڵ کاتدا دەمێنێتەوە.





٢

(پیستی ٣)

تەنها کاتێك تۆ ئەم شیعرە دەخوێنیتەوە

بوونی دەبێ، ئەگەر حەز دەکەی بوونی هەبێ،

کەواتە لە نێو بوونی خۆت نیشتەجێ بە

-وەکو من- هەمیشە نوێ، سەرباری تێپەڕینی ساڵ لە دوای ساڵ...

تۆ شیعری منی بەرزتر لەم هۆنراوانەی من

کە ڕۆژێك لە ڕۆژان نووسیمن، ماچ بە ماچ، لەسەر پێستەکەت

وەکو چۆن گەمییەکی چارۆکەدار ڕێڕەوی خۆی لەسەر زەریا جێ دەهێڵێ

ناوبەناویش شەپۆلیش ڕابردوو دەسڕێتەوە.

کارمەن

١

(پیستی ٢)

چۆن بتوانم سەرجەم وشەکانی دونیات بۆ بنووسم...

پەیامەکان شیتەڵ کەم، سەرجەم دەرگاکان بکەمەوە؟

ئەوەم کەشف کرد کە لە جەستەتدا خەرەندێکی بچووك هەیە

بۆ هەتاهەتایی دەکرێتەوە و ڕام بپێچێ تاکو خۆی؛

جیهانێکی نوێ لە پێش چاوم دەکرێتەوە...

هەست دەکەم کە شتەکان شیکلیان گۆڕاوە.

ئێستێك دەکەم -تەنها ساتێکە- لە نێو مەرگدا پێچراوەتەوە.

هەسارەکان دەورانی بێوچانی خۆیانیان هەیە.
ئەستێرەکان لە نیوەشەودا ڕادەوەستن.
کات ئیدی ناخولێتەوە لە نێو کاتژمێرەکانیشدا؛
کەچی تۆ هەر لەوێی...
وێڕای چاوە ڕۆشنەکانت، وەکو زەریا لە ناومدا لێدەدا،
حەز ناکەی لە نیوەڕێگای خەرەنددا بەجێم بهێڵی؛
ڕووتیشم، لە عەدەمدا، بەرەو خۆت ڕاپێچم دەکەی
وەکو ئینسانی یەکەم دوورتر لە بن و بنەچەی.
هەنووکە دەزانم ئەتۆ کێی.
پێویستیم بەوە نییە بەدووتدا بگەڕێم.
تاقە وشەیەك هەموو سیحرەکان هەڵدەوەشێنێتەوە؛
تەنانەت ئەگەر هەموو شتێکیش کۆتایی بێ...
تەنانەت ئەگەر بێت و تا ئاستی ئەم وجودە لێڵە دابەزی،
سەیری چاوانت بکەم، کاتێك هەموو شتێك دەگوزەرێ،
لەم کاتە ئەبەدییە ڕێگای هەڵهاتنت پێشنیاز دەکەم...
پێکەوە دەبین
جارێکی دی بە ئاسوودەیی...

٢
( پیستی ٥)
بە خەوتووی نێو خەوەنەکانم دەچیت
بە نووکی ڕووناکییەك دەکەیت کە شەو بارگاوی دەکەی...
نزیکی دواسنووری فەزام دەبیتەوە و





تەلاشی ونکردنت دەکەم.

تەنها سێبەر هەن بەبێ ژیان،
بەتاڵی لە ئامێز دەگرم...
خۆم بە دەستی خۆم ڕۆحی خۆم دەتوقێنم،
دەمرێت و خەونەکانم هەڵدەلووشێ -تا دێتیش تاریکتر-
وەکو بوونەوەرێك کە نەبێ.
من تەنها لە گەڵ خەونێك کە پێکەوە دادەخرێین؛
هێدی هێدی دەمرم و تێدەگەم —درەنگیشە-
من خۆم ئەو خەونەم.
لە پڕێکدا دێمەوە ئاگا و دەستت لێدەدەم، ڕووت...

"بە خۆشییەوە!"
ترپەترپت جارێکی دی بە نێومدا دەگەڕێ ؛ دەست لە خۆم دەدەم،
دڵنیا نیم کە لە مەرگ ڕزگارم بێ...
لە نێو زەریایەکی پرسیاردا دەتوێتەوە
نەوازش لەگەڵ پێستت دەکەم.
................................
دەستلێدانێك کە دەخزێ، چەشنی ئاگر،
لەسەرخۆ نەوازش لەگەڵ لەشت دەکەم
لەشی بڵێسەیەکی نادیاری
ئەڤینێکی بەگوڕ.
بارانە ماچەکانم پرسیار دەکەن:
ئایا تۆ وەڵامی؟ هەر خێرا

داتدەنیشێنم، دەبێتە وەڵام و پرسیارگەلێك -عیشق-
وێڕای نەوازش هەمدیسان هەمان پرسیار.

ئەی زمانی هاوبەش، خۆی دەدا بە دەستەوە، لێوانلێو!
عیشقی هەناوم خاوەن هیچ زمانێك نییە تا بەرگەی ماچێك هەڵگرێ...
یا بۆ نەوازشێکی سادەی دووبارەبوو
بۆ هەتا هەتا...
سنووری هەردووکمان تەی کات!

٣
(پیستی ٦)
نغرۆم دەکەی، جارێکی دی بەرەو خەرەندی دەمت بەرزم دەکەیتەوە،
بەرەو هەوا پەلکێش دەبم و تورِ هەڵدەدرێم.
ماچەکانی تۆن، وەکو پەرەمووچی نێو سەرین
لە نێو شەڕی زارۆڵاندا پەرشوبڵاو بوونەوە، لێومان شکستبارن.
چرپەچرپێکی نەرمونیان فشار دەخەنە سەر پێستەکەت.
لە ناوەوە دەتوروشێنێ وەك سەهۆڵی ئاگر.
ئاهەنگێکی ماچ بە ڕووتی هەڵدەقرچێن
لە نێو پەرگاڵی چارۆکەیەك لەسەر جەستەت ڕەنگی داوەتەوە
لە ناوەوەت دەسووتێن وەکو ڕۆح...
منیش لە نێو ڕووبارەکە ڕادەگری.
ڕێڕەوەکەت بەرەو زەریا ڕام دەپێچێ و کریستاڵی
دەستەکانت، جارێکی دیش لە نێو ئاگر دەمسووتێنێ و





دەتسووتێنێ لەو شوێنەی کە ئارەزوو نیشتەجێیە...
دووتر لە مەرگ، دوورتر لە ژیان
بەرەو ژیانێکی دی کە لەگەڵ تۆ دەبێ...

تۆ زەریای... منیش با-م کە شەپۆلەکانت دروست دەکا.
تۆ عەردی، منیش ڕووناکی ڕۆ دەچمە بوونتەوە.
ئێمە بەشێکی جیهانین کە هەردووك پێکی دەهێنین
کە شەوان وەردەچەرخێ، لە نێو چەرچەفە سپییەکان،
لە نێو ئەڤینندا.

(پیستی ٧)
"ڕەسیدم پێشکەشی پێکەنینت کرد..."
لۆس ڕۆدریگێس
تەنها زەردەخەنەیەك بە ڕووی ئاسمان
بە نێو سیما غەمگینەکانی بەرامبەری مندا تێدەپەڕن،
تۆ بە تەنها، تەنها تۆ بزە دەکەی -وەکو درزە تیشکێك-
وا دەکات کە هەموو لەگەڵ ژیانی تۆدا بدرەوشێتەوە.
تۆ تەنها نیت، خۆشەویست، من لەگەڵ تۆدام.
تۆ تەنها نیت، خۆشەویست، ئەگەر دەستبەردارم نەبیت...
بۆچی تەنها ئامادەگیی تۆ ڕووناکم دەکاتەوە و
لە عەردەوە تا تۆ بەرزم دەکاتەوە.
ئەمە زەردەخەنەی تۆیە هێمن وەکو زەریا
کە هێدی هێدی لە نێو لمدا گیانی دەدات بە دەستەوە.
زەردەخەنەکانت شینن وەکو شەپۆلی زەریا

شەوان چاوەکانت ڕۆشن دەکەنەوە...
وەك فەنەری سەر منارە بەرزەکانی کەنار
تاکو بەرەو تۆ خۆم داڵدە بدەم لە کاتی باوبۆراندا...
هەندێ جار خەون بەوەوە دەبینم کە خۆم نغرۆ کەمە نێو بوونت
لە نێو خەرەندە بێبنەکانی تۆدا وێڵ بم.
ببمە ئەو بیرۆکە لێڵەی کە خۆی دەرباز دەکات
بۆ ئەوەی لە ناوی تۆ نیشتەجێ بێ کاتی دەنوویت،
بەڵام من تەنها زەردەخەنەی تۆم دەوێ...
لە نێو ئامێزت ببمە خۆشەویست
توند لە نێو خۆیم بگرێ
بۆ ئەوەی بە نێو ژیاندا گوزەر بکەم
ئەوەی تۆ هەستی پێدەکەیت.

بەڵێ، من بە هێزم، خۆشەویست، کاتێك تۆ لاواز بووی،
، تەنها دڵۆپەبارانێك بەسە بۆ ئەوەی بریندارت بکا
بۆ تۆ قەڵغان و جەنگاوەرم
، و ژیانت دەپارێزم.

ۆشەویست، خۆت حەشار نەدەی.
ۆشەویست، بە نیوەچڵ خۆت پێشکەش ناکەیت
بێ چارەنووس.
ۆشەویست، ئەوەی هەموو دەدا
ەوە هەموو خۆمم کە هەم
ەوەی دەمدەیتێ دووپات و دووپاتی دەکەمەوە.





خۆشەویست... لە ژیانم زیاتر
بە زەردەخەنەت ڕۆشن دەبێتەوە.

بە ڕۆح خۆشت بوێم
ئەو برینانەی کە ماچەکانی تۆ دروستیان کرد
لەگەڵ خۆت بۆ بەهەشتم بەرە.
بە لەش خۆشت بوێم، بە میهرەبانی،
بە لێکخشاندن من لە خەونی تۆوە پەیدا بووم
کە دەکەوێتە ژێر پێستەکەمەوە.
لەگەڵ جیهان خۆشمت بوێ.
خۆشمت بوێ بە چاو و بە دەستەکانت
بوونت لە هەر ماچێکدا دەدۆزیتەوە
هەمیشە نوێی و جودا...
وەکو خۆت دەتەوێ، خۆشمت بوێ...
ئیدی من هی تۆم، خۆشەویستەکەم، لە هەموو بارێکیشدا
دەست بەسەر ڕووناکییەکانی زەردەخەنەکانت دەگرم.

سەرچاوە:
https://www.facebook.com/david.gomezgomez.127?fref=ts

# سەرەتاکانی مۆدێرنیزم لە هونەری شانۆدا

**دانا ڕەئووف**

هیچ شانۆکارێك بە درێژایی مێژوو، هێندەی "ئێدوارد گۆردن کرەیگ" ١٨٧٢-١٩٦٦ بە قەیران و مەسەلەکانی چاکسازیی شانۆوە خەریك نەبووە. ئەم هونەرمەند و ڕیژیسۆرە دەیویست سەرلەنوێستراکتوری شانۆ و بنەماکانی لە دیدێکی هونەری و تێڕوانینێکی جیاواز و سەراپاگیرییەوە ڕۆبنێتەوە. شانۆ هونەرێکی گشتگیر و فرەتوخمە، هیچ توخمێکیشیان لەوی تریان گرنگتر نییە. هەر لەم ڕووەوە لە گفتوگۆیەکیدا، لەگەڵ بینەرێکی شانۆدا دەڵێت: "هونەری شانۆ هەر نواندن و شانۆنامە نییە، هەروەها دیکۆر و سەمای شانۆیش نییە، بەڵکو تێکەڵاوبوون و تێکهەڵکێشکردنی هەموو ئەم توخمانەیە. شانۆ لە جووڵەی شانۆیی پێك دێت، کە ڕۆحی نواندنە و لە پەیڤ، کە جەستەی شانۆنامەکەیە، لە هێڵ و ڕەنگەکان، کە دڵی دیمەنەکانن و هەروەها لە ڕاگرتنی ڕیتم، کە وزەی سەمایە. هیچ کامێکیشیان لەوی تریان گرنگتر نییە".

کرەیگ لە ساڵی ١٨٧٢دا لە بنەماڵەیەکی هونەری لەدایك بووە. باوکی، ئەدوارد ولیەم، ئەکتەرێکی گەورە و ناسراو بووە، خاتوو ئەلیانۆر ئەلیسی دایکیشی بە شاژنی کۆشکی شانۆی ئینگلیزی ئاماژەی بۆ کراوە. کرەیگ لە تەمەنی

دوانزەساڵییەوە چووەتە سەر شانۆ و لە شاکارەکانی شەکسپیردا، بەتایبەتی ڕۆڵی هاملێت و ماکبێس و ڕۆمیۆی بینیووە. بەڵام ئەم ئەکتەرە لاوە هەر لە سەرتاوە هەست بە تەنگژەکانی شانۆی ئینگلیزی دەکات. لەبەر ئەوە، بڕیاری ئەوەی داوە واز لە نواندن بهێنێت و لەبری ئەوە پاکژکردنەوە و چاکسازی لە بوارەکانی شانۆدا بگرێتە ئەستۆی خۆی. کرەیگ لە یەکێك لە یاداشتەکانی نێوان ساڵانی ١٩٠٥-١٩٠٦دا نووسیویەتی: "وازم لە نواندن هێنا... خەونم دەدی. هەوڵم دا خەونەکانم بە هۆی هێڵ و ڕەنگەکانەوە لەسەر کاغەز بکەمە ڕاستی. ئەمەیش شتێکی نەکردە بوو... دوای ئەوە یەکەم نەمایشەکانم پێشکەش کرد". کرەیگ دوای دوورکەوتنەوەی لە نواندن، ڕوو دەکاتە نووسین و بڵاوکردنەوەی بابەتی تێوری تایبەت بە شێوازەکانی تەکنیکی شانۆیی و دیدی خۆی سەبارەت بە پاشەڕۆژی شانۆ، دەخاتە ڕوو. لە ساڵەکانی ١٨٩٦یش بە دواوە، ڕووی کردووەتە دەرهێنانی ئەزموونە شانۆییەکانی و یەکەم نەمایشی ددانپیانراویشی، کە لە لەندەن پێشکەش کراوە، یەکێك لە دەقە بەراییەکانی هێنریك ئیپسن دەبێت. دواتر ئیپسن لە هەموو ژیانی هونەریدا دەبێتە نووسەرێکی نزیك لە دید و هزرە شانۆییەکەی و دوو لەو سێ نەمایشەی، کە لە دوای ساڵانی ١٩٠٥وە پێشکەشی کردوون، لە شانۆنامەکانی ئیپسنەوە بوون. کرەیگ هەر لە دەستپێکی کارەکانییەوە دەیویست هەموو چەمکە ڕۆمانسییە نەتەوەییەکان و ڕیالیزمێکی ئەتنۆگرافی لە سیمای کارەکانی و سینۆگرافیاکانی داماڵێت و تەنها بە فۆرم و ڕەنگ و ڕووناکی ئەتمۆسفێر و ڕیتمی ناوەوەی دراماکان بەرجەستە بکات، دەیویست سیمبۆلی وێنەیی بۆ هزر و بیرۆکە ناوەکییەکانی دەقەکان بدۆزێتەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش ئەکتەرەکانی لەسەر شانۆ لە یەکتر دادەبڕی و هەموو پانتایی و ژینگەی شانۆکەیشی لە تاریك و ڕوونێکی سیمبۆلیزمەکاندا دەپێچایەوە. ئەمەیش سەرەتای ناکۆکییەکانی بوو لەگەڵ ئەکتەرەکانیدا، کە بەو جۆری ئیشکردنەی کرەیگ قایل نەدەبوون.

کرەیگ بۆ ڕوونکردنەوەی دیما و دیدە جودا و ناتەباکەی، هێڵکاری، نەخشە، وێنەی دیمەن و پانتایی شانۆ و جووڵەی ئەکتەر و سینۆگرافیاکانی دروست دەکرد و لە پێشانگای تایبەتیدا و لە شارەکانی بەریتانیادا پێشانی دەدان. هەر لەو دەمیشەوە دەیویست قوتابخانەیەکی هونەریی تایبەت بە خۆی بکاتەوە تا بتوانێت لە بنەما سەرەتاییەکانەوە ڕیفۆرمەکانی بڵاو بکاتەوە. بەڵام هیچ پشتیوانییەك بە دەست ناهێنێت. لەم بارودۆخەدا، بەتایبەتی لە ساڵەکانی ١٩٠٤دا لەسەر داوای ڕێژیسۆری ئەڵمانی (ئۆتۆ براهام) دەچێتە بەرلین. بەم



شێوەیەیش ژیانی دیاسپۆرای دەست پێدەکات و لە لەندەن و شانۆی ئینگلیزی دوور دەکەوێتەوە. بەڵام بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ کەسێکی وەك ئۆتۆ براهام ڕێك ناکەوێت. ئەمەیش شتێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراو بووە، لەبەر ئەوەی ئۆتۆ براهام مەڵبەندێکی گرنگ و پتەوی شانۆیەکی سروشتگەرایی ئەو دەمەی ئەورووپا دەبێت.

لە سەرەتای ساڵانی سەدەی ڕابردوودا گۆڤارێکی شانۆیی بە ناوی "دەمامك"ـەوە بڵاو دەکاتەوە. یەکەم ژمارەی ئەم گۆڤارە لە ساڵی ١٩٠٨دا لە فلۆرەنس دەردەچێت. گۆڤاری (دەمامك) گرنگیی داوە بە تێور و مێژووی شانۆ و لەم ڕووەوە کرەیگ گوتوویەتی: "ئاییندەی شانۆ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە، کە تایبەتن بە شانۆی ڕابردوو... بەبێ گەڕانەوە و لێکۆڵینەوە لە شانۆی کۆن، زۆر گرانە بتوانین شانۆیەکی نوێ بخوڵقێنین". هەر لەم ساڵانەدا گۆڤاری دەمامك چەند ژمارەیەکی تایبەتی سەبارەت بە کۆمیدیای دیلارتی دەردەکەن. هەر لە فلۆرەنسیش لە ساڵی ١٩١٣دا ئامۆژگایەك بۆ هونەری نواندن دەکاتەوە. ئەم ئامۆژگایە ناوبانگێکی نێونەتەوەیی گەورە بە دەست دێنێت و لە هەموو ئەورووپاوە خوێندکار ڕووی تێدەکەن. هەروەها دەبێتە مەڵبەندی بڵاو کردنەوەی گۆڤاری دەمامك، بەڵام لە ساڵی ١٩١٤دا، بە هۆی یەکەمین جەنگی جیهانییەوە دادەخرێت.

کرەیگ لە ساڵی ١٩٠٥دا کتێبێك بە ناوی هونەری شانۆ بڵاو دەکاتەوە و لەم کتێبەیشدا هەموو هەوڵ و تەقەلا هونەریی و دیما و دیدی خۆی لەبارەی چاکسازی و قەیران و ئێستاتیکای شانۆوە دەخاتە ڕوو. کرەیگ لەم کتێبەدا ئاوڕێکی پڕ لە ڕەهەند و ڕەخنە لە ئەزموونی داهێنانی شانۆیی خۆی، وەك ڕێژیسۆر و بەڕێوەبەری هونەریی شانۆکانی ئەو دەمەی وڵاتەکەی و بەشێك لە شانۆکانی ئەورووپا ئەداتەوە. ئەم ئەزموونە دەوڵەمەندەیش تەنها بۆ شانۆکاران، جا ئەو شانۆکارانە، شانۆنامەنووس، ڕێژیسۆر، ئەکتەر، ئامادەکاری جلوبەرگ، نەخشەسازی سینۆگرافیا و کارە هونەرییەکانی تری پشتەوەی شانۆ بن، سوودبەخش و گرنگ نییە، بەڵکو بۆ هەموو ئەوانەیش گرنگە، کە دەیانەوێت ئاستی بینین و چێژی خۆیان بۆ کارە شانۆییەکان برەو پێبدەن. ئەوەی شایانی باسە، ئەم کتێبە بۆ یەکەم جار بە زمانی ئەڵمانی و لە بەرلین لە شێوەی نامیلکەیەکی چل لاپەڕەییدا بڵاو کراوەتەوە، بەڵام دواتر کرەیگ بە

بەردەوامی کاری لەسەر کردووە و لە هەموو ڕوویەکەوە دەوڵەمەندی کردووە و چەندین بەشی تری بۆ زیاد کردووە.
لە لای کرەیگ بینەری شانۆ هیچی کەمتر نییە لەو هونەرمەندانەی کارە هونەرییەکان دەخوڵقێنن. بەبێ ئامادەبوونی بینەران داهێنانی شانۆیی لە شتێکی بۆش زیاتر هیچی تر نییە. لەبەر ئەوە، کرەیگ ئامادەبوونی بینەران بە هەند وەردەگرێت و بە ئامرازێکی گرنگیشیان لە نێوان شانۆ و هۆڵی بینەراندا دەزانێت. هەر لەبەر ئەوەیشە لەم کتێبەدا، چەند دیدار و گفتوگۆیەکی قووڵ لە نێوان ڕێژیسۆر و بینەراندا؛ سەبارەت بەوەی کە بینەر چیی لە شانۆ دەوێت و بە چ شێوەیەك دەبێت هونەرمەند، بەتایبەتی ڕێژیسۆر، کە نووسەری نەمایشە شانۆییەکانە، بگاتە ئاستەکانی ڕەزامەندی و تێگەیشتن و کاردانەوەی بینەران، لەخۆ دەگرێت. کتێبەکەیش زۆر فراوانە و لە چەندین بەشدا، گرفتە کردەیی و تیۆرییەکانی شانۆ و پەیوەندیی هونەرمەندی شانۆ بە شانۆ و بینەران و پرۆسەی شانۆوە ڕوون دەکاتەوە. بۆ نموونە: هونەرمەندانی شانۆ و داهاتوو، هونەری نواندن، ڕێژیسۆری شانۆ، سینۆگرافیا و جووڵە، هیوا بە ئایندە، ئەکتەر و شانۆی بووکەڵە، تەوژمە کوشندەکانی شانۆی هاوچەرخ، شانۆنامە و شانۆنامەنووسەکان، شانۆ لە ڕووسیا و ئەڵمانیا و بەریتانیا، دیدارەکانی پسپۆری شانۆ و بینەر، بینەر و ڕێژیسۆری شانۆ، تارمایی لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا. کە لە تارماییەکانی شەکسپیریش دەدوێت، دیدێکی کردەیی و ئێستاتیکیی هەیە. بۆ نموونە، بەم شێوەیە باسی ماکبێس دەکات: "لە ماکبێسدا، ئەتمۆسفێری تراجیدیاکە، لە چڕی و هێزی نهێنییەکاندایە. لەبەر ئەوە، دەبێت شێوازی نواندنیش هێزێکی گەورەی ڕاز و نهێنی بیخوڵقێنێت، ئەوەی ئەو جوانییەش دەبەخشێت بەم تراجیدیا پڕ لە نهێنییە و ئەو سەراپاگیرییە بێسنوورە، وشە و تارماییەکانن. ئەو وشانەی کە هەرگیز گوێمان لێیان نابێت، ئەو تارماییانەیشی لە سێبەری نهێنییەکاندا دەجوڵێنەوە. ئەمانە توخمە سەرەکییەکانی پڕ لە ترسی تراجیدیاکەن". هەروەها ڕێبازی ڕیالیزم و ئەکتەریش بەشێکن لەو تەوەرانەی لەم کتێبەدا باسی کردوون. ئەم تەوەرانەیش چەندین بەش و تەوەری تر و تێڕوانینی تیۆریی جودا دەگرنە خۆ. ئەم هونەرمەندە، لە چەندین شوێنی ئەم کتێبەدا، ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە ڕێژییەکی خراپ و نواندنێکی نزم، شانۆ وێران دەکەن و فیکری نووسەریش دەشێوێنن.

کرەیگ ئەم کتێبەی دوای ئەزموون و کارێکی دوورودرێژ و ململانێ و بەڕێوەبردنی شانۆ گەورەکانی ئەورووپا نووسیووە، لەبەر ئەوەی ئاگاداری بزووتنەوەی شانۆی



ئەوروپی بوو، خۆیشی جگە لە بەریتانیا، لە ئیتالیا و ئەڵمانیا و ڕووسیا و لەگەڵ ڕیژیسۆرەکانی ئەو دەمە، بۆ نموونە، ستانیسلاڤسکی کاری کردووە. دەیزانی گرفتەکانی شانۆ لە ڕووی بەڕێوەبردن و فیکر و تەکنیکەوە لە کوێ و لە چیدان. کتێبەکەیش کورتکراوەیەکی ئەو ئەزموونە دەوڵەمەندە و دەستنیشانکردنی تەنگەژەکان و ڕێگاچارەسەرە بنەڕەتییەکانە، هاوکات گونجاندنی هونەری شانۆیە لەگەڵ پێشکەوتنە گەورەکانی کۆمەڵگای ئەوروپی، چ لە ڕووی تەکنەلۆژیا و چ لە ڕووی ئابووری و بارووددۆخە کۆمەڵایەتییەکانەوە. کرەیگ لەم کتێبەدا دەیەوێت پێناسەیەکی تێوری بۆ هونەری شانۆ بکات و وێنەیەکی ڕەهای لە دەرەوەی چەمکەکانی نەتەوە و ڕێسا تەقلیدییەکانەوە پێببەخشێت "هیوادارم ئەوەتان لە یاد بێت، کە من باسی شانۆ دەکەم، بە هیچ شێوەیەك مەبەستم شانۆی ئینگلیزی نییە، هەروەها ئەو شتەیشی بە شانۆی فەڕەنسی ناوزەد کراوە. مەبەستیشم ئەوە نییە، کە خەڵکی ئاماژەی بۆ دەکەن؛ ئەوە شانۆی ئەڵمانی، ئیتاڵی، سوێدی یان ڕووسییە، هەموو شانۆکانی دونیا چوونیەکن و تەنها لە زماندا جیاوازییان هەیە... دوای ئەوە، جێگای داخە! کە شتە هەڵە و بێمانا و ڕێگرەکان، لە هەر شوێنێك بن، هەر یەکن، ئەمەیش جێگای پێکەنینە". هەروەها ئەم هونەرمەندە بە چاوی گومان و دڵەڕاوکێ و دوودڵییەوە دەیڕوانییە هەموو شانۆکانی ئەوروپا و ئەمەریکا، لە پێش هەمووشیانەوە شانۆی ئینگلیزی. لەبەر ئەوە، هەمیشە لەگەڵیاندا لە کێشەدا بووە. کرەیگ نە خانووبەرەی شانۆکان، نە ئەوەیش، کە تیایدا پێشکەش دەکرا، نە ئەکتەرەکانی و نە ئاستی نواندنەکەیان، نە ڕیژی و نە ڕیژیسۆرەکان، تەنانەت کرێکاری شانۆ و کارمەندە هونەرییەکانیشی بە دڵ نەبووە. کرەیگ بە ڕاشکاوانە گوتوویەتی "پێویستە ئەکتەر وەلاوە بنرێت و لەبری ئەو شتێکی تری بێگیان دابنرێت- با ئەو شتەیش بە سوپەر-بووکەڵە ناوزەد بکرێت، ئەمەیش تا ئەو کاتەی خۆی ناوێکی باشتر دەدۆزێتەوە".

ئەوەی جێگای سەرنجە، تەنانەت ئەو بینەرانەیش کە دەچوونە ئەم شانۆیانەوە، جێگای ستایش و ڕەزامەندیی ئەو نەبوون، بەڵکو ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد، کە زەوقی ئەو بینەرانە بە تەواوی شێوێندراوە، باش و خراپ لەیەك جیا ناکەنەوە و تەنها بۆ کاتبەسەربردن و خۆدەرخستن دەچن بۆ شانۆ. کرەیگ چەندە گرنگیی بە دەق و فیکری

شانۆنامەکان دەدا، هێندەیش مەسەلەکانی تر، نواندن، ڕووناکی، جووڵەی جەستە، ڕەنگەکان، مۆسیقا و سینۆگرافیا پێگە و گرنگیی خۆیان هەبووە. جووڵە لە پانتاییە شانۆییەکەدا توخمێکی بەبەها و ڕیژیسۆریش خاڵی پێگەیشتن و ناوەندگەرایی بووە و یەکەیەکی یەکگرتووی لە نێوان جووڵە، سەرچاوەکانی ڕووناکی و پانتایی شانۆدا خوڵقاندووە. هەر لەم دەروازەیەشەوە جووڵانەوە فیزیکییەکانی کردووە بە ناوەندێکی دراماتۆرگی مۆتیڤە شانۆییەکان. شانۆ بۆ کرەیگ بنەما قووڵ و سەرەکییەکانی گەڕاوەتەوە بۆ سەما و جووڵانەوە ڕیتمئاساکانی. هەست و سۆز لە بنەماکانی یەکەیەکی فیکری و ستراکتورێکی هونەریدا لە بەریەککەوتنێکی بەردەوامی بەهێزدان، ئەم بەریەککەوتنەش بینەران لە پرۆسە هونەرییەکەدا کۆ دەکاتەوە. (من بەوە قایل نابم، کە وێنە و دیمەنی سینۆگرافیاکەم تەنها لە شانۆنامەکەوە سەرچاوە وەربگرن، بەڵکو دەبێت لەو دید و فیکرەوە، کە شانۆنامەکە لە ئەندێشەمدا دروستیان دەکات).

کرەیگ بە هەموو شێوەیەك دژی شانۆی واقیعی و ناتورالیزمی دەبێت. لە کارەکانیدا زیاتر پەنای دەبردە بەر وێنە و هێما و شانۆیەك، کە لەسەر بنەماکانی بینین ڕۆنراوە، نەك لەسەر گوێگرتن و گێڕانەوەی چیرۆکەکان. لەبەر ئەوە، دەیویست ئەکتەرەکانی ببنە بەشێك لە هێڵ و ڕەنگ و دەنگ، جووڵەی جەستەش ببێتە تەواوکەری وێنە گشتگیرەکە و توخمێك لە توخمەکانی سینۆگرافیا و ڕووناکی. هەر لەبەر ئەوە هانی ئەکتەرەکانی دەدا، کە دوای خوێندنی نواندن و گەیشتن بە ئاستێکی باڵا، هەوڵ بدەن بە هۆی جووڵەی جەستەوە درك بە شتە نەبینراو و وێناکراوەکان بکەن و وەکو شتێکی بینراو مامەڵەی لەگەڵدا بکەن. مەبەستیش لە شتە وێناکراوەکان ئەو وێنە جۆراوجۆرانەن، کە لە نەستدا بە شاراوەییەوە هەڵگیراون، ئەکتەر بە چاوی مێشك دەیانبینێت نەك بە چاوی ڕاستەقینە، لە نواندنیشدا پەنایان بۆ دەبات بێئەوەی بیریان لێبکاتەوە. ئیتر لە جووڵەی ئەندامەکانی جەستەدا بەرجەستە دەبن و بۆ ئەکتەر دەبن بە چوارچێوەیەکی هونەری و بۆ بینەریش دیوە ئێستاتیکییەکەی نواندن. کرەیگ لەم ڕووەوە گوتوویەتی: (ئەگەر فەزا ئەو دەریایە بێت، کە جووڵە مەلەی تیا دەکات، ئەوا جووڵە ئەو ئاسمانەیە مۆسیقای تیا دەگوزەرێت... حەز دەکەم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، کە هەموو شتێك لە جووڵەوە سەرچاوە دەگرێت... تەنانەت مۆسیقایش، دەمەوێت ئەوەیشتان بێنمەوە یاد، کە خوای گەورە ئەو توانایەی پێبەخشیووین وزە و توانا





گەورەکانمان لە ڕێگای جووڵەوە دیاری بکەین؛ هەموو شانۆکانیش، لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، لە جووڵەوە دروست بوون، جووڵەی جەستەی مرۆڤ. ئێمە ئەم ڕاستییە باش دەزانین/.../) بە بڕوای کرەیگ، مرۆڤ، کە دەژی و کار دەکات، تەنها لە ڕێگای جووڵە سمبۆلئامێزەکانەوە و لە نێو سمبۆلەکاندا هەست بە بوونی خۆی دەکات. ئەو نەوانەش کە هەست بە بەهای سمبۆلەکان دەکەن، نەوە بەرز و گەورەکانن (سمبۆل شتێك نییە، کە تەنها لە شێوازەکانی هونەردا بێت، بەڵکو لە ڕەگوڕیشەی هەموو ژیاندایە؛ ئێمە ناتوانین وا لەم ژیانە بکەین مرۆڤ بتوانێت تیای بژی، تەنها لە ڕێگای سمبۆلەکانەوە ئەوە دەکەین، کە ئێمە بە بەردەوامی بەکارییان دەهێنین).

کرەیگ قوتابییەکی بە ئەمەکی مۆدێرنیزم بووە، کە هەمیشە بە مێژووی شانۆ و زانستەکانی شانۆدا قووڵ بووەتەوە و گەیشتووە بە بەرئەنجامی نوێ و ئەڵتەرناتیڤی جیاواز. بێگومان ئەکتەرەکانی کرەیگ نەیاندەتوانی دیدە هونەرییەکەی ئەم هونەرمەندە بەرجەستە بکەن و نەشیاندەویست لە کۆشکی پادشایەتیی شانۆکان بێنە خوارەوە. ئەکتەرەکانی ئەو سەردەمە ئەکتەری بینەران بوون و خۆیان ڕێژسۆر و ئەکتەر بوون، هەموو ئامراز و پێداویستییەکانی تری شانۆ لە بەرژەوەندی و خزمەتی ئەواندا کاری دەکرد. کرەیگ، بە پێچەوانەوە، چەندە دژی ئەکتەر دەبێت، هێندە گەرەکی بووە کۆرس لەسەر شانۆ بەکار بهێنێت و لە وێنەیەکی سەمائامێزی بەکۆمەڵیی گۆریۆگرافیدا بیانجووڵێنێت. لە یاداشتەکانی ساڵانی ۱۹۰۹دا ئەوەی دووپات کردووەتەوە، کە (هیواخوازم ئەکتەر بە تەواوی دوور بخەمەوە، بەڵام کۆرسی دەمامکپۆش لەسەر شانۆ بهێڵمەوە). دەمامکیش بەهایەکی تایبەتمەندی بۆ کرەیگ هەبووە؛ شاردنەوەی سیمای دەموچاویش بە دەمامك مانای شاردنەوەی هەموو شتە خودگەراییەکانی لە پشت توخمە گەردوونی و هەتا هەتاییەکانەوە گەیاندووە. دەمامك بۆ ئەو مانای ئەوە بووە، کە سروشت/ڕیالیزم لە پشت هونەر/ سیمبۆلەوە بشارێتەوە.

کرەیگ لە ئەنجامدا ناچار دەبێت، دەستبەرداری ئەکتەرەکانی ببێت و لەبری ئەوان بووکەڵەی گەورە بەکار بهێنێت. لەم ڕووەیشەوە گوتوویەتی: (ڕەوشێکی شاعیریی سەیر دەبینم، ئەو بووکەڵانە بە شێوەیەکی بێگەرد ڕۆڵی دیمەنەکان

دەبینن، بە شێوەیەك زۆر لە ئەكتەرە ڕاستییەكان ئەو توانایەیان نییە. بووكەڵەكان ئەوەی پێیان دەسپێردرێت، بەبێ كەم و زیاد دەیكەن). كرەیگ بووكەڵە وەكو شتێكی پڕ لە ڕاز و نیاز دەبینێت، كە بوونێكی ڕیالیزمی و بینراوی هەیە، لە هەمان كاتدا هێماگەلی بەرجەستەكردنی خەونێك بووە بۆ ئەو، كە هیچ ئەكتەرێك نەیتوانیووە بگاتە ئەو ئاستە. بووكەڵە وێنەی دونیایەكی یۆتۆپیی بۆ ئەو دەستەبەر دەكرد، كە سنووری گەمەكانی بە شێوەیەكی تر بۆ دادەڕشتەوە.

كرەیگ گەیشتبووە بڕوایەكی پتەو، كە هەموو جۆرە شتێكی ڕێكەوت و ڕاگوزەری و دوور لە پلان بۆ دانان و لێكۆڵینەوەی ورد، دوژمنی هونەرە. هەر بۆیە پرۆژەكانی خۆی بە وردی پلانیان بۆ دارێژرابوو. بۆ ئەو لە پێش هەموو شتێكدا، بوونی مرۆڤ لەسەر شانۆ، كە هەڵگری دیما و بۆچوونێكی خودگەراییە، دەبێت بە تەواوی تێك بشكێنرێت. لە باسێكیشدا، كە لە ساڵی ١٩٠٧دا بە ناونیشانی (ئەكتەر و سوپەر بووكەڵە)وە نووسیوویەتی، باسی ئەوە دەكات، كە چۆن لەبری ئەكتەر بووكەڵەیەك لەژێر دەستی ڕێژیسۆردا ملكەچ و قایلە و فۆرمی خۆی بەپێی ئەو پلانە وردەی بۆی دیاری كردووە، وەردەگرێت و لە وێنەیەكی جوان و باڵادا جووڵانەوەكانی بەرجەستە دەكات. ئەم جۆرە فیگورانەیش (بووكەڵانە) لە هەموو جۆرە خودگەراییەك داماڵراون و بە هیچ كاتێكیشەوە پابەند نین. كرەیگ خۆی وێنەی ئەم بووكەڵانەی كێشاوە و بەو بەرگە سپییانەوە، كە دەیكردنە بەریان، دەبوونە فیگوری پڕ لە ڕاز و نیاز و سیمایەكی نهێنیئامێزیان لەخۆ دەگرت. كرەیگ بۆ دروستكردنی جلوبەرگی ئەكتەر و بووكەڵە گەورەكانی، ئاماژەی بۆ كاریگەریی جلوبەرگی گرێكی كۆن و میسری فەرعەونی لە لایەك و چین و ژاپۆن و هندستان لە لایەكی ترەوە كردووە. ئەم كاریگەرییانەیش پێكهاتەیەكی جودا و كۆكردنەوەی كولتوورەكان و دووركەوتنەوە لە شتە ڕواڵەتئامێز و تەقلیدییەكانی خوڵقاندووە و لە هەمان كاتدا سیمبۆلێكی گریمانەیی بۆ بووكەڵەكان دروست كردووە.

كرەیگ بە دید و دیما هونەرییەكانی لە هونەرێكی گشتگیر نزیك دەبێتەوە، كە لە ڕیتم و جووڵانەوە پێك هاتووە. بووكەڵەكانیشی دەنگدانەوەیەكی ئەو شانۆیە بوون، كە سیمایەكی خواوەندیان لەخۆ دەگرت و بۆ ئەو دەبوونە خەونێكی پڕ لە گەمە. بووكەڵەكانی كرەیگ بوونە ئامرازی گەیاندنی ئەو جووڵانەوەیەی كە لە دەرەوەی زەمەن و شوێنەكانەوە دەهاتن.

كرەیگ بە شێوەیەكی بەردەوام پانتایی و ژوورە شانۆییەكانی لە پرۆسەیەكی





ئەزموونگەریدا دەگۆڕی، گۆڕانکارییەکانیش ئامرازە بەکارهێنراوەکان، سینۆگرافیا، ئەکتەر، بووکەڵە، ڕەنگ، ڕووناکی، مۆسیقا و پانتایی شانۆیان دەگرتەوە. بۆ نموونە، داهێنانی سیستێمێکی بزۆزی پەردەکانی قووڵایی و ئەملاوئەولای شانۆ، هەلومەرجی ڕووناکی و بەکارهێنانی (ئاو) بۆ ڕەنگدانەوە و چڕکردنەوەی تیشکی ڕووناکی؛ ئەمەیش لەپێناوی شکاندنی ئەو وەهمەی شانۆی ڕیالیزم و سینۆگرافیا سروشتگەراییەکان دروستیان دەکرد و دەیویست شانۆیەك ڕۆبنێت، کە لە هەموو شتێك پاکژ بکرێتەوە و زیاتر لە ڕۆحی سەماوە نزیك ببێتەوە.

کرەیگ هونەرمەندێکی فرەبەهرەی لێهاتوو بووە: وێنەگر، وێنەکێش، ڕەخنەگری شانۆ، ڕۆژنامەنووس، نووسەر، مۆسیقاژەن، نەخشەسازی سینۆگرافیا و هونەری ڕووناکی بووە و لە هەموو ئەم بوارانەشدا مامۆستایەکی دەگمەن بووە. ئەم توخمانەی لە نەمایشەکانیدا کۆ کردوونەتەوە و لەسەر ئاستێکی بەرز و بە دیقەتێکی ورد و بە لێزانینێکی بێهاوتا بەرجەستەی کردوون. هەندێك لە ڕەخنەگر و پسپۆرەکانی شانۆ ئەوە دووپات دەکەنەوە، کە کرەیگ شاعیری شانۆ بووە و توانیوویەتی لە هیچەوە دونیایەکی گەورە بخوڵقێنێت. گەمەی بە ڕووناکی و ڕەنگەکان کردووە. هەر بەم گەمەیە کۆشك و خانووبەرەی بێسنووری لەسەر شانۆکان ڕۆناوە، پەنای بردووەتە بەر پەردە و بە پەردەی ئاسایی مەوداکانی شانۆی قووڵ کردووەتەوە و دیمەنەکان لە جووڵە و گۆڕانکارییەکی بەردەوامدا بوون. بە بەکارهێنانی پەردە سیستێمێکی تایبەتمەند دادەهێنێت؛ بۆ نموونە، پەردەکان بزۆز بوون و لە نێو ڕووناکی و سێبەردا جووڵاونەتەوە و فۆرمی هەمەچەشن و ژووری جیاواز و شێوازی ئەندازیی خوڵقاندووە، ئەمەیش دەبێتە بنەمایەکی گرنگی پرۆژەکانی. بەکارهێنانی سەرچاوەکانی ڕووناکییش تەواوکەری پەردە بزۆزەکانی ئەم سیستێمە هونەرییە بوون. چاوگەکانی ڕووناکی بە شێوەیەکی بەربڵاو و لە هەموو ئاستەکانی سەر شانۆدا بەکار هاتوون؛ لەژێر تەختەی شانۆوە، لەسەر دوو پردی تایبەتمەند لە نزیك پێشەوەی تەختەی شانۆ و لەملاوئەولای لاتەنیشتی شانۆکەیشەوە. کرەیگ بڕوای بە دواڕۆژ هەبووە، بەڵام ئامادەیی ئەوەیشی تیا بووە، کە سازش بکات و بە هەندێك لە هەلومەرجەکان قایل بێت و کار بەو ئامرازانە بکات، کە لەبەردەستدا بوون: "من

لەو بڕوایەدام، کە ڕۆژێك دێت بتوانین هونەرێك لە بواری شانۆدا، بەبێ بەکارهێنانی دەقی شانۆیی نووسراو و بەبێ پەنابردنەبەر ئەکتەر بخوڵقێنین. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا من لەو بڕوایەدام، کە پێویستە ئێمە بەپێی ئەو هەلومەرجانەی بۆمان ڕەخساون، لەسەر کارەکانمان بەردەوام بین". دیدێك دواتر بووە بنەمایەکی گرنگی تەوژمێکی ئەزمووونگەری و لای زۆربەی شانۆکارەکانی دونیا، هەر لە ئاڕتۆوە تا بروك کاریان لەسەر کردووە.

کرەیگ بەم دیدە جیاوازەی بۆ شانۆ شتێکی تری هێنایە ئاراوە، کە دواتر بووە ناوەندێکی گرنگی تێور و لێکۆڵینەوە شانۆییەکان و دەستپێکی پتەوی بۆ لێکۆڵینەوە سیمبولیزم و مۆدێرنەکانی دراما و هونەری شانۆ و داهێنانی زاراوەگەلێکی نوێی شانۆیی کردەوە.

کرەیگ، بۆ نموونە، لەژێر کاریگەریی شانۆی ژاپۆنیدا بانگەشەی جۆرە دابڕانێکی فراوانی لە نێوان ڕۆڵ و ئەکتەردا، ئەکتەر و بینەراندا، دەکرد؛ سیستێمێك دواتر برێشت لە تیۆرە شانۆ داستانییەکەیدا جەختی لەسەر کردووەتەوە.

ئەوەی کرەیگ دەیویست لە بواری شانۆدا بە دەستی بهێنێت، شکاندنی وەهم و دوورکەوتنەوە لە شانۆیەکی ڕیالیزم و سرووشتگەرایی و پشتکردنە بنەما دەروونناسییەکان بووە. نەمایشەکانیشی بە دەستپێکی ئێستاتیکای دابڕان و خوڵقاندنی شانۆیەکی شیعرئامێزی وێنەیی و فرەڕەهەند دادەنرێن. کرەیگ بە بیست ساڵ بەر لە برێشت تەکنیکی (نامۆبوون)ی بەکار هێناوە، بەڵام لە لای ئەو سەبارەت بە شانۆیەکی دیالێکتیکی نەبووە، بەڵکو زیاتر فۆرمێکی شانۆیی و ئێستاتیکی لەخۆ گرتووە. برێشت تەکنیکەکەی کرەیگ وەردەگرێت و لە بنەما ڕەخنەییە-مێژووییەکانەوە ئاوێتەی پرۆگرامە سیاسییە دیالێکتییەکەی خۆی دەکات و هەنگاوێکیش زیاتر دەچێتە پێشەوە و زاراوە و چەمکی (نامۆبوون) دادەهێنێت.

هەرچەندە کرەیگ دژی شانۆی ڕیالیزم و ناتورالیزم دەبێت، بەڵام ڕێزێکی زۆری بۆ هەوڵەکانی ستانیسلاڤسکی دەبێت و لە شانۆی هونەری مۆسکو، لە پرۆژەیەکی هاوبەشدا شانۆنامەی هاملێت پێشکەش دەکەن. ستانیسلاڤسکیش بە چاوی ڕێز سەیری کرەیگی کردووە و وەکو بلیمەتێکی بێوێنە ئاماژەی بۆ کردووە. ستانیسلاڤسکی لە یەکێك لە نامەکانی ساڵی ١٩٠٩دا نووسیویەتی (ماوەیەکی درێژ دەخایەنێت تا لە کرەیگ دەگەین، لەبەر ئەوەی ئەو نیو سەدەیەك لە پێش زەمەنەکەی خۆیەوەیە، ئەو شاعیرێکی گەورە و هونەرمەندێکی بەرزە و ڕێژیسۆرێکی بەسەلیقە و پڕ لە زانیارییە). کرەیگ لە



کتێبەکەشیدا (هونەری شانۆ) چەندین جار تیشك دەخاتە سەر هەوڵەکانی ستانیسلاڤسکی و شانۆی هونەری مۆسکۆ و دەڵێت: ( /.../ ستانیسلاڤسکی، شتێکی گەورەی بە دەست هێناوە؛ شانۆیەکی دامەزراندووە، کە هیچ سیمایەکی بازرگانیی پێوە نییە... هەروەها بڕوای بە ڕێبازی واقیعی هەیە، لەو دەروازەیەوە، کە بە هۆی ئەم ڕێبازەوە دەتوانێت ڕاڤەی ژیانی سایکۆلۆژیی کارەکتەرە شانۆییەکان بکات، هەرچەندە من بڕوام بەمە نییە). هەروەها کرەیگ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە شانۆکەی ستانیسلاڤسکی قوتابخانەیە، هەر لە بەیانییەوە تا شەو و بە درێژایی ساڵ کاتەکانی خۆیانی تیا بەسەر دەبەن، تەنها چەند هەفتەیەك نەبێت کە پشووی هاوینیان هەیە. (بەڵام لە بەریتانیا، دەتوانیت بچیتە هەر شانۆیەکەوە، لە هەموو ڕۆژەکانی ساڵدا، لە تەنها دارتاش و ڕیژیسۆرێك و چەند مووچەخۆرێك زیاتر کەسی تر نابینیت، شانۆکەی کۆنستان شەو و ڕۆژ پڕە لە خەڵك).
کرەیگ لە ساڵی ١٩٠٨دا چوار جار سەردانی مۆسکۆی کردووە، بەم شێوەیەش یەکەم گفتوگۆکانی شانۆنامەی هاملێت دەستی پێکردووە، نەمایشەکەیش بۆ یەکەم جار دوای چوار ساڵ، لە هەشتی مانگی یەکی ساڵی ١٩١٢دا پێشکەش کراوە.
کرەیگ لە هاملێتدا پەنای بردووەتە بەر پەردەی لە کانزا دروستکراو؛ ئەم پەردانە بەپێی ئاماژە و سیستێمە تایبەتمەندەکەی کرەیگ بە شێوەی تاك یان کۆ جووڵاونەتەوە، هاتوونەتە پێشەوە، لار بوونەتەوە، گەڕاونەتە دواوە، چوونەتە نێو یەکترەوە تا بەو شێوەیە جۆرەها شێوە و شێوازی جودایان دەستەبەر کردووە. کرەیگ بە دوو ساڵ ئەم پەردانەی ئامادە کردووە، بەڵام هەر لەگەڵ یەکەم شەوی نەمایشکردنی هاملێتدا، لەبەر قورسی و گران بەکارهێنانی پەردەکان، هەمووی داڕماوەتە خوارەوە بۆ سەر شانۆکە.
کرەیگ گەرەکی بووە هاملێت وەکو مۆنۆدراما بەرجەستە بکات، ئەمەیش مانای وابووە کە بینەران کارەکتەر و ژینگەی شانۆنامە و تێکڕای ڕووداوەکان بە چاوی هاملێتەوە ببینن. کرەیگ هاملێت بە تەنها لە دونیایەکی ئاڵتونیدا دەبینێت و هەموو دەوروبەرەکەیشی لە مێگەلێك زیاتر هیچی تر نین. پەردە کانزاییەکانی کۆشکی پادشا ئاڵتونی بوون، پادشا و شاژن بە بەرگێکی ئاڵتونییەوە لەسەر عەرشێکی ئاڵتونی دانیشتوون و عەباکەی سەر شانی پادشایش، کە لە زێڕ و زیودا بریسکاوەتەوە، هێندە گەورە بووە، هەموو سەر تەختەی شانۆکەی داپۆشیووە. ئەم عەبا

ئاڵتونییە چەند کونێکی لێرە و لەوێ تێدا بووە، لە هەر کونێکەوە سەری یەکێك لە پیاوان و دەست و پێوەندەکانیان هاتووەتە دەرەوە. بەم شێوەیەیش دەست و پێوەندی کۆشکیش لە نێو ئەو زێڕ و زیوەدا بزر بوون. دیمەنەکەیش بە سەدای شەیپورێکی گەورە، کە پادشا قاو دەدات، لەسەر دەسەڵاتە تاوانکارییەکەی دەری دەپەڕێنن. هاملێت لەم دونیا ئاڵتونییەدا بە جلوبەرگێکی ڕەشەوە، بە تەنها لە بیرکردنەوەیەکی قووڵی بێپەروادا، لە پێشەوەی شانۆکەدا وەستاوە و چاودێریی ڕووداوەکانی کردووە.
کرەیگ لە دوارۆژەکانی ژیانیدا لە پاریس دەگیرسێتەوە، هونەرمەندە گەورەکانی دونیایش، لەوانە ئەدۆڵف ئاپیا، ماکس ڕاینهارت، ژاك کۆبۆ و پیتەر بروك... هتد سەردانی دەکەن و گوێ لە پەیڤ و ئامۆژگارییەکانی دەگرن.


سەرچاوە:

١- في الفن المسرحی، أدوارد جردون كريج، ترجمه درينی خشبه، الدار المصريه اللبنانييه، ٢٠٠٠

Den moderna teaterns genombrott 1890_1925, Gosta ,2
M.Bergman. Stockholm 1966

Arne Tjader Per, Fruktan, medkensla och kritisk distans. Den 3_
vesterlendska dramateorins historia. Stockholm 2000








گابریل گارسیا مارکیز

# نووسینەکانی کەناری دەریا

لە فارسییەوە

ڕەووف بیگەرد

گابریل گارسیا مارکیز
نووسینەکانی کەناری دەریا
ڕەووف بیگەرد

# نامەیەکی نەگەیەندراو...

## کۆچەر ئەبوبەکر

لە کونی دەرگاکەوە بمبینە چۆن بچووك بوومەتەوە، بمبینە چۆن بیر لەوە دەکەمەوە ڕابردوو بە پەتەوە بکەم. بمبینە چۆن خۆم دەڕژێنمە شووشەی بۆنەکەوە و چۆن لە قوتووی مووروووەکاندا خۆم خڕ دەکەمەوە. بمبینە چۆن ڕابردووم دەخورێت. ژوورەکەم تەرمی ئینجانە و گۆرانی و ئەو وێنانەی لێکەوتووە، کە بۆ هەمیشە بە زەردەخەنەوە دەمێننەوە. سەیرکە ئێمە چ تۆتالیتارێکین بۆ وێنەکان، سەیرکە چۆن دەمانەوێت خۆمان لە دڵخۆشیدا بهێڵینەوە، سەیرکە ئازیز، سەیرکە چۆن دەمانەوێ خۆمان لە وێنەکان و لە قاقاکاندا



جێ بهێڵین. بمبینە چۆن هەوڵ دەدەم ئەو بەشە لەسەر پاکەتی جگەرەکەم بسڕمەوە، کە نووسیوومە:
(توند بمنووسێنە بە ژیانتەوە، مەهێڵە هیچ پیاوێکی تر دەست بە ژنێتیمەوە بگرێ).
ئێمە نەمانتوانی هاوبەشی بە خوێنێك بکەین، کە لەناوماندا بۆ یەکتر فیچقەی دەکرد. لە کونی دەرگاکەوە بمبینە، چۆن شەرعیەت بە پچڕانی تەزبیحەکەی دەستم دەدەم. دەیاندڕێنم شەوگەلێك کە لە ئاسمانمان دزی و ئاسمانێك کە جێی فڕینی ئێمەی تێدا نەبووەوە. ڕەنگە وردکردنی پەنجەرەکان، یان خوێنهێنان لە مەچەك، یان خواردنەوەی بتڵێك شەراب، یارمەتیدەرێکی باش بن بۆ بەرگەگرتنی ئەم دۆخە.
منداڵێکی بچووك لە ناومدا، کچێکی قژڕەش لە قووڵاییمدا، هەمیشە تۆی دەوێ و من دەمەوێت دەمکوتی بکەم.
ددانی پێدا دەنێم ئێمە لە جەنگێکی ڕانەگەیەندراودا یەکترمان دۆڕاند.
بە ئومێدێکی زۆرەوە، وەکو جەنگاوەرێکی دۆڕاو، وەکو پشیلەیەك کە حەوزی ماسییەك دەشکێنێ، وەکو پیرەپیاوێك کە هەموو تەزبیحەکانی فرۆشتبێت، لە نیوەڕۆیەکی دەستکرددا جێت دەهێڵم.
ددانی پێدا دەنێم هەموو ئەستێرەکانی سینەما ناوی تۆیان هەڵگرتووە، هەموو ئێوارەکان بۆنی گۆرەوییەکانی تۆیان لێدێت، هەموو شەوەکان نووساویت بە شووشەی پەنجەرەکەوە. لە هەموو بەیانییەکانمدا لای ڕادیۆکەی نەنکمەوەیت. عەسران لە پەنجەرەکەوە دەتبینم لە کۆڵانەکەدا پیاسە دەکەیت. پێڵاوەکانت لە ژوورەکەمدا لە نزیك سەتڵی خۆڵەکەوە جێماون، وجودیشت پانکەکە پەخشی دەکات بەسەر کەشیماڵەکەدا. ددانی پێدا دەنێم تۆ لە هەموو شوێنێکیت، تەنانەت بە جەستەی ئەو پیاوانەشەوەیت، کە لە بەردەممدا ستایشی خۆشەویستی دەکەن و پەڵەی خوێنی ژنەکانیان بەسەر بوونیانەوەیە. ددانی پێدا دەنێم لە بەیانییەکاندا جێمام، ئەو بەیانییانەی لەژێر پێستی گەنمیمەوە وەکو دەمارێکی شین هەستم پێدەکردیت ئەی سەدای من. من لە تەنیشتی ئاگردانەکان و لە شەوە ساردەکان و لە شەقامە چۆڵەکانی شار و لە گیرفانی ڕاستی چاکەتەکەتدا جێمام ئەی سەدای من.

**2014**



ئەنجامدانی ئەم دیدارەی من لەگەڵ شێرکۆ بێکەسدا بۆ ئەوە بوو، تا ببێت بە بەشێك لە تەوەرێکی ناو نامەی ماستەرەکەم، کە لەسەر نوێکردنەوەی شێوازی شیعریی کوردییە، بە نموونەی "شێواز لە هۆنراوەکانی فەرهاد شاکەلیدا". ئەم نامەیە گرنگیی خۆی هەیە، چونکە گرووپی ڕوانگە لە پێش گرووپی کفری لەدایك بووە. هەردووك تەواوکاری یەکترن و دەقەری ئەدەبیی سلێمانی دەبەستێتەوە بە دەقەری ئەدەبیی گەرمیانەوە. ئەوەی بایەخ و گرنگیی زیاتر بەم دیدارە دەدات، ئەوەیە لەگەڵ شاعیری کوردستان مامۆستا شێرکۆ بێکەسدایە، کە بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی گرووپی ڕوانگە دادەنرێت و هەر خۆیشی ناوی -ڕوانگە-ی بۆ ئەم گرووپە پێشنیاز کردووە. لەو ڕۆژ و ڕێکەوتەی کە ئاماژەم پێداوە، گەیشتمە خزمەتی و هێڵە گشتییەکانی ئامانج و مەبەستی دیدارەکەم بۆ ڕوون کردەوە و نامەیەکم جێ هێشت، چونکە ئامێری تۆمارم لا نەبوو. حەزم کرد بە دەستوخەتی خۆی نامەیەکم ئاڕاستە بکات، کە پرسیارەکان لە ناوەڕۆکدا وەڵام بداتەوە، هەر وابوو.

حەزم نەکرد دەستکاریی ڕێنووس و زمانەکەی بکەم، چونکە شێوازی خۆیەتی، ڕای خۆی دەربڕیووە، وەکو پایونیرێکی گرووپێکی گرنگی ئەدەبی، چەند زاراوەیەکی بەکار هاوردووە، وەکو ئازادیی ڕادەربڕین، ڕای خۆیەتی وەکو شاعیرێکی گەورە و بیرمەندێکی بەرجەستە. دیارە مەبەستی فراوانی هەیە لەو زاراوانە، نەك مەبەستێکی تایبەت، واتە مەبەستی ئەدەبیی تێدایە، ئەم نامە لە بنەڕەتدا داخراو بوو، حەزم کرد کراوە بێت لەبەر گرنگیی ناوەڕۆکەکەی و وەکو خاڵی وەرچەرخان لە ئەدەبی کوردیدا "شیعر، چیرۆك" لەو ڕۆژگارەدا، کە زیاتر لە چل ساڵە. هیوادارم ئامانجی خۆی پێکابێت.

حسێن کەلاری

سلێمانی/ ڕۆژی سێشەمە ٢٠٠٨/١/١



**برای بەڕێز**
**کاک حسێن کەلاری**

بە هیوای هەمیشە تەندروستی و چاو و دڵ ڕوونیتانم، نامە جوانەکەتم بەدەست گەیشت و وا منیش لەخوارەوە وەڵامتان ئەدەمەوە و هەوڵ ئەدەم لەبارەی بزووتنەوەی ئەدەبیی ڕوانگە و نوێخوازیی ئەو سەردەمەوە شتێکتان بۆ بنووسم، ئەگەرچی زۆر جاری تریش لەم بارەیەوە قسەم کردووە:
لەڕاستیدا سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئەدەبیی ڕوانگە لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆ و هۆکاری ناوخۆیی و مەوزوعییەوە هاتەکایەوە: لەوانە بارودۆخی لەباری دوای ڕێکەوتننامەی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراق. واتە جۆرێك لە ئازادییەکی نوێ بۆ ڕادەربڕین. ئەدەبی کوردی لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا سست و لاواز و کەم پەخش بوو، گەشەکردنی بزووتنەوەی نوێخوازی لەناو وڵاتانی عەرەبیدا، بەتایبەت لە لوبنان و میسر و کاریگەری ئەم ئەدەبە بەسەر ئەدەبی عەرەب زمانەوە لە عێراقدا، "گۆڤاری شیعر ٦٩"، هەروەها گرووپی کەرکوك "سرگون بولص، جليل القيسي، فاضل العزاوي و ئەوانیتر"، ئەو بزووتنەوە سیاسی و ڕووناکبیرییانەی لەو سەردەمەدا دنیایان هەژاندبوو. وەکو شۆڕشەکانی ئەمریکای لاتینی "گیڤارا، کاسترۆ"، بزووتنەوەی خوێندکاران لە فەڕەنسادا، گەورەبوونی شۆڕشی ئەیلوول و هاتنەکایەی مرۆڤی پێشمەرگە، ئەمانە هەمووی کەم تا زۆر دەوری خۆیان هەبوو لەسەر نوێخوازی کورد بەگشتی و ڕوانگەییەکان بەتایبەتی، ئێمە لەڕێی بەیاننامەی ڕوانگەوە "گۆمە مەنگەکەمان شڵەقان"، لەمەیش گرنگتر بەرەنگاربوونەوەی فیکری غەیبی

و کۆنەخوازی بوو.

بەیاننامەی دووەمی ڕوانگە لەگەڵ کۆمەڵێ مەلادا لە هەڵەبجە و سلێمانی، واتە ئەو بەیاننامەیەی بە ناونیشانی "ئەی قەڵەمە نەترسەکان یەکگرن"ـەوە، ئێمە کۆمەڵێك لاوبووین، کە دیارترینمان ئەمانەبوون: حسێن عارف، جەلال میرزا کەریم، کاکە مەم بۆتانی و من، هەڵبەت هەر لەو ڕۆژگارەدا کۆمەڵێ نووسەر و شاعیری تری نوێخواز هەبوون، گەرچی لە ڕوانگەدا نەبوون، بەڵام دەوری بەرچاویان بۆ تازەکردنەوەی هەبووە، لەوانە: عەبدوڵا پەشێو، لەتیف حامید، لەتیف هەڵمەت، ئەنوەر قادر محەمەد، ڕەفیق سابیر و فەرهاد شاکەلی، هەر لەو سەردەمەدا، چەند نووسەر و شاعیرێکی تر هەبوون کە بەتەمەن لە ئێمە مناڵتر بوون، بەڵام بەهرەداربوون و لەگەڵ ڕەوانگەدابوون لەوانە: سەڵاح شوان، سەلام محەمەد و سامی شۆڕش، دیارە هەر لە کەرکوکدا دەوری لەبەرچاوی ئەحمەد شاکەلی و عەبدوڵا سەڕاج و موکری و هەر لەو ساڵانەیشدا لەبواری شانۆدا دەوری سەلمان فایەق و فازڵ جاف بۆ ئەم نوێخوازییە گرنگ و پڕ بەها بوو، خوالێخۆشبوو چرۆکنووس لەتیف حامید لە کەرکوکدا لە هەمووان دیارتر بوو، ئێمە بینیمان و زۆریشی حەز ئەکرد بەیاننامەکەمان لەگەڵدا ئیمزا بکات. بەڵام لەبەر هەندێ هۆ و هۆکاری سیاسی نەیکرد، کە لێرە جێی باسکردن نییە.

نوێخوازانی کەرکوك، لەو سەردەمەدا کاریگەریی زۆری نووسەر و شاعیرە عەرەبەکانی کەرکوکیان بەسەرەوە بوو، واتە گرووپی (سەرگۆن و فاضل و جەلیل و ئەوانی تر)، کە دیارە من ئەمە وەك خاڵێکی ئیجابی تەماشا ئەکەم. وەلێ لەوکاتەدا شتێك نەبوو بەناوی (گرووپی کفری)یەوە، ئەم زاراوەیە، لەم ساڵانەی دواییدا هاتە ناوەوە. بەهەرحاڵ بەلای منەوە نەخشەی شیعری کوردی چ لەوسادا و چ لە ئێستەدا چ لە داهاتویشدا تاقە کەس و دوو کەس نایکێشن، بەڵکو ئیبداعی هەمووان دروستی دەکات، هەریەکە و بە ستایل و شێوازی خۆی، بۆیە بەلای منەوە هەموو ئەو شاعیر و نووسەرانەی ناوم بردوون هەریەکە و شتێکیان خستۆتە سەر ئەم خەرمانی تازەکردنەوەیە.

دیارە فەرهاد شاکەلیش، کە تەوەری ماستەرەکەی تۆیە یەکێکە لەوان، دیوانی (کودەتایەکی نهێنی) یاخیبوونێکی شیعری جوان بوو چ لەڕووی زمان و داڕشتنەوە. چ لەڕووی فانتازیا و وێنەی داهێنەرانەوە، بەتایبەتی لەوکاتەدا ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم ساڵانی ١٩٧١ - ١٩٧٢ بوو کە کەوتە بەردەستی خوێنەران، هەڵبەتە دیوانی (ژێ)

ی کاك فەرهاد، کە پێموایە لە هەشتاکاندا دەرچوو، هەڵکشانێکی گەورەی شیعر و ئەزموونی ئەو بوو، هەر لە سەرەتای حەفتاکاندا، دیوانی "خوا و شارە بچکۆلەکەمان"ی لەتیف هەڵمەت لەم تازەکردنەوەیەدا بۆ شیعریی کوردی مژدەبەخش بوو. من یەکەم دیوانم "تریفەی هەڵبەست"، **1968** و دووەم دیوانم "کەژاوەی گریان" لە ساڵی ١٩٦٩دا بڵاوبوونەوە.

لەناو شیعرەکانی ئەم دوو دیوانەدا چەند شیعرێکیان جێگەی سەرنج و لەسەر وەستانن، بۆ نموونە شیعری "زەردەخەنە لە فرمێسکدا" یەکێکە لەو شیعرانە و باشم لە بیرە، کە خوا لێخۆشبوو لەتیف حامید بەم شیعرە سەرسام بوو، پێموایە کردبووشی بە عەرەبی، لە دیوانی دووەمدا شیعری "کەژاوەی گریان"یش خۆی سەرەتایەکی تازەبوو بۆ نووسینی چیرۆکی شیعریی تازە کە دواتر لە ئەزموونەکانی ترمدا کاملتر بوون.

بۆ زانیاری خۆیشت هەردوو بەیاننامەی یەکەم و دووەمی ڕوانگە، یەکەمین ڕەشنووس من خۆم نووسیومە و لەدواییدا لەلایەن برایان حسین عارف و جەلال میرزا کەریم و کاکە مەم بۆتانییەوە تەماشاکرایەوە و دوای دەستکارییەکی کەم بڵاوکراونەتەوە. وشەی "ڕوانگە" هەر لەلایەن خۆمەوە پێشنیارکرا.

لەڕاستیدا بەیاننامەی "ڕوانگە" قووڵ نەبوو جۆرێك لە پەلەکردنی تێدابوو. لەڕاستیدا ئەبوایە شمولیتر بوایە و لەسەر مەسەلەی زمان و فانتازیای شیعر و فۆرمی شیعر زۆرتر بوەستایە!. ڕووناکبیرە مارکسییەکانی ئەو سەردەمە بە توندی دژی ڕوانگە وەستانەوە، پێموایە وایان ئەزانی ئەم بزووتنەوەیە ژێر کاسەیەکی سیاسی و حزبی هەیە. کە لەڕاستیدا وانەبوو، چونکە ئیمزاکەرانی بەیاننامەی ڕوانگە تێکەڵەیەکی سەیر بوون لەڕووی سیاسی و فیکرییەوە، لە چەپی چەپەوە بۆ قەومی و بۆ پارتی، بەڵام هەموومان لە یەك نوختەدا یەکمان گرتبوو، ئەویش ئەوەبوو هەر یەکێکیان لە قەفەزی حیزبێکەوە هاتبووە دەرێ، واتە ئازادبووین و لەوکاتەدا کەسمان ئینتیمامان بۆ هیچ حیزبێ نەبوو. بەکورتی لە حیزبایەتی هەڵاتبووین و ئەمانویست ئەو بۆشاییە بە کاری ئەدەبی پڕبکەینەوە، ڕوانگە بکەینە ئەڵتەرناتیڤێ بۆ تێڕوانینمان بەرامبەر بە ژیان، کە ئێمە لە ئەدەبی تازەدا ئەوەمان ئەبینییەوە. ئێمە بەهۆی ئەو ڕووناکبیرە نوێخوازانەوە کە ئەو سەردەمە لە ڕۆژنامەی "هاوکاری"دا کاریان ئەکرد و هاوڕێمان بوون و لەو ڕۆژنامەیش بەولاوە، ڕۆژنامەیەکی وا بەربڵاو نەبوو. توانیمان بە یارمەتی ئەو هاوڕێیانە لەوانە؛ کەمال رەئوف محەمەد و هەروەها سەربەست بامەڕنییەوە هەردوو بەیاننامەکەی خۆمان بڵاوبکەینەوە. دیارە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەی دووەم "ئەی قەڵەمە نەترسەکان یەکگرن" بووە هۆی ئەوەی یەکەم مەلاکان تەکفیرمان بکەن و ناومان بە دەرگای مزگەوتەکاندا هەڵواسن و جگە لەوەیش وەفدێك بەڕێخەن بە سەرۆکایەتی خەتیبی سلەیمانی بۆ لای

ڕەحمەتی مەلا مستەفای بارزان دیارە بە قەتڵی سەرمان. بەڵام لەو دانیشتنەدا، من ئەبێ بۆ مێژوو ئەوە بڵێم خوالێخۆشبوو فەرەنسۆ حەریری لێ ئەبێت، ئەو مەردانە لەسەر ئێمە ئەکاتەوە و بارزانی خاو ئەکاتەوە کە هیچمان دەربارە نەکەن.
لە هەمان کاتدا لە کۆشکی کۆمارییەوە کاك سەربەست بامەڕنی بانگ ئەکەن و گوێی ڕائەکێشن و بەڵام لەبەرئەوەی لەوکاتەدا سیاسەتی بەعس وابوو، کە گوێی لە شکایەتە دینییەکان نەدەگرت هیچیان دەربارە نەکردین، تەنها ئەوە نەبێ، کە لە مێژووی ڕۆژنامەگەری حکومیدا یەکەمجار بوو حکومەت خۆی ڕۆژنامەی هاوکاری بۆ ماوەی یەك هەفتە ڕاگرێت. بەیاننامەی دووەمی ڕوانگە هەنگاوێکی ئازایانە بوو بۆ لەسەرکردنەوەی مافی ژن و ئازادی ژن و یەکسانی، من لە ژیانی خۆمدا ئەم کارە بە کارێکی جوان و پرشنگدار ئەزانم، کارێك کە وشە بێتە مەیدانەوە و، ڕووبەڕووی کۆنخوازی و عەقڵی سەلەفی بوەستێتەوە، ئەمە بەر لە ٣٥ ساڵ زیاتر! ئایا ناکرێ ئەمە بە یەکەمین وێستگەی ڕاپەڕینێك دژی عەقڵی سەلەفی لە کوردستاندا لەقەڵەم بدرێ؟! من ئەمە بۆ ڕوناکبیران و ئەدیبانی کورد بەجێ ئەهێڵم!
لەو ڕۆژگارەدا دەرکردنی بەیاننامەی ئەدەبی و ڕوناکبیری جۆرێك بوو لە مۆرکی ئەو سەردەمە. دیارە لە مێژووی شیعر و ئەدەبیاتی دنیاشدا کۆنە، پێموایە (موستەقەبەلییەکانی)ی ڕوسیا بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩١١دا واتە "مایکۆڤسکی و هاوڕێیانی" دەریانکرد. بەیاننامەی ڕوانگە بۆ یەکەمجاریش سەرەتای بزووتنەوەیەکی ڕەخنەیی دروست کرد، کە پێشتر بەو جۆرە نەبوو. هەڵبەت دەوری نووسەر و ئەدیبی ناسراو مەحمود زامدار، واتە بە زمانی عەرەبی و بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەکاندا سەبارەت بە بزووتنەوەی ڕوانگە دەورێکی لەبەرچاوە. هەموویشمان ئەوە ئەزانین کە وەك سەرەنجام هەموو داهێنانێکی ئەدەبی بۆ تاکی موبدیع ئەگەڕێتەوە و پەیوەندی بە گروپەوە نییە، بۆ نموونە حسین عارف بەر لە ڕوانگەیش خۆی هەر داهێنەر بووە، یان هەر ئەدیبێکی تر. من بڕوام بەوە نییە تازەکردنەوەی شیعر بە تەنها لە فۆرمدایە، بۆ نموونە گۆران هەر لەبەرئەوە پێشەنگی تازەکردنەوە نییە، کە گەڕایەوە سەر کێشی میللی لەمە گەورەتر بەلای منەوە ڕوانینی تازەی گۆران بوو بۆ ژیان، بۆ شیعر، بۆ سروشت، بۆ جوانی. تا تێپەڕکردن و سنووربەزاندن بۆ هەر نوێکردنەوەیەك "لە فیکردا نەبوو"، شکڵیش نایەتە گۆڕین، جیهانبینی گۆران بۆ تازەکردنەوەی لە عەقڵی تازەوە لە دونیای تازەوە و سەردەمی گۆڕانە گەورەکانەوە سەرچاوەی گرت. هەروەها ئەتوانین بۆ سەیاب لە عێراق و نیما

یوشیج ـ یش لە ئێران هەروا بڵێین شاعیر هەیە شکڵی نووسینی بە ڕواڵەت تازەیە، بەڵام بە عەقڵی هەزار ساڵ لەمەوبەر بیرئەکاتەوە!.

لەبارەی "ڕوانگە"وە گەلێ قسەی نامەنتیقی و بێ بنەما و بێ بەڵگە کراوە، هەندێکیان ئەوەندە بێ ویژدانانە کراون تارادەی ئەوەی بمانکەن بە جاسوسی ئەمنییەکانی عێراق!!. هەندێکی تریان بە نەخوێندەوار و جاهیل لە قەڵەممان بدەن!. بەهەرحاڵ زەمان خۆی درۆ و ڕاستی لە بێژەنگ ئەدا و داوێتی، من بۆ خۆم بە چاوی ڕق و کینەوە تەماشای کەس ناکەم. ڕەنج و داهێنانی کەسیش ناسڕمەوە. ڕێزی زۆریشم بۆ ئەو شاعیر و ئەدیبانە هەیە کەوا وەك من بیرناکەنەوە و تەنانەت دژی بیرکردنەوەی منیشن، من داوای تەمەن درێژی و تەندروستی باشیان بۆ ئەکەم. من لە کۆتایی ئەم نامەیەدا هەر ئەوەندە ئەڵێم "ڕوانگە" لە سیاقی مێژوویی خۆیدا "هاوارێك بوو بۆ تازەکردنەوە و دەربازبوون لە هەموو عەقڵ و کۆت و پێوەندێکی سەلەفی" یان وەك زۆر جاریش وتوومە "بەردێك بوو گۆمە مەنگەکەی ئەو ڕۆژگارەی شڵەقاند"، ئێمە دیوارە ئەستوورەکەی بیر و شکڵی تەقلیدیمان نەڕووخاند، بەڵام درزێکمان تێکرد بۆ ئەوەی نەوەی دوای خۆمان باشتر زەفەری پێبەرن!

هەر بژین

سلێمانی

براتان

شێرکۆ بێکەس

٢٠٠٨/١/١

